

زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وآله وسلم)

یەکەم

# ئەبوبەکری سدیق

(رضي الله عنه)

ئامادەکردنی: خوبەیب کوردی



# زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ

## ــ یەکەم ــ

# ئەبو بەکری سەدیق (رضي اللة عنة)

ئامادەکردنی: خوبەیب کوردی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي أمر بالجهاد في سبيله، ووعد عليه الأجر العظيم والنصر المبين، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له القائل في كتابه الكريم (وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نصْرُ الْمُؤْمنِينَ)الروم:٤٧ وأشهد أن محمدا عبده ورسوله وخليله قائد المجاهدين وأصدق المناضلين وأنصح العباد أجمعين ﷺ وعلى آله الطيبين الطاهرين، وعلى أصحابه الكرام الذين باعوا أنفسهم لله وجاهدوا في سبيله حتى أظهر الله بهم الدين وأعز بهم المؤمنين، وأذل بهم الكافرين رضي الله عنهم وأكرم مثواهم وجعلنا من أتباعهم بإحسان إلى يوم الدين.

زۆرجار ئێمەی موسڵمان بەشێکی ژیانمان تەرخان دەکەین بۆ خوێندنەوەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی و شوێنکەوتوانی، جاری وا هەیە لە بەشێکی ژیاننامەکەدا بەسەرهاتێك کارمان تێدەکات و هەوڵ دەدەین لە ژیانماندا بیکەینە چرایەك بۆ ڕووناککردنەوەی بەرپێمان، چونکە مرۆڤ زووتر لەگەڵ ڕووداوە واقعیەکانی ژیانی مرۆڤایەتیدا زیاتر کاریگەر دەبێت،

ئەم زنجیرەیە بەم مەبەستە نووسراوە، چۆن هاوەڵان بناسین و دیوەجوان و ڕازاوەکانی ناو ژیانی هاوەڵان شارەزابین و بتوانین پەند و وانەیان لێ وەربگرین و لە واقیعی ژیانماندا جێبەجێ بکەین.

ئەم شێوازی فێربوون و فێرکردنە لە قورئانەوە فێر دەبین، کاتێك خوای گەورە پاش گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێغەمبەران، دەفەرمووێت: (لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَى وَلَكِنْ تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ)يوسف. (سوێند بەخوا لەداستان و سەرگوزەشتەی یوسف و براکانیدا، گەلێ عیبرەت و ئامۆژگاریی مەزن هەیە، بۆ خەڵکانی هۆشمەندو ژیر کە بیکەنە ڕێ نیشاندەری خۆیان، بۆ دۆزینەوەی هەق و ڕاستی، دیارە کتێبێکی وەکو ئەم قورئانەش، هەرگیز ناشێ قسەوباسێکی هەڵبەستراو بێت، بەڵکو تەصدیق وپشتڕاستکردنەوەیە بۆ کتێبە پێشووەکانی بەرلەخۆی و شیکەرەوەی هەموو شتێکیشە، بەتەواوی بەیانی حەڵاڵ و حەرامی تێدایە و ڕێ نیشاندان و ڕەحمەت و میهرەبانی خوایە بۆ خەڵکێ بیەوێ باوەڕ بهێنێت).

بەویستی الله تعالی درێژە بەم زنجیرەیە دەدەین و هەولدەدین ژیانی زۆربەی هاوەلان بلاو بکەینەوە بە چەند مەبەستێك:

یەکەم: بزانین کەسانێك توانییان خوا لە خۆیان ڕازیی بکەن، چۆن ژیان و چۆن توانییان ئەو ڕەزامەندییە بەدەست بهێنن.

دووەم: تێبگەین ئەزموونی پەیڕەوی پەیامی خوا ناواقیعی نیە و تەنها لە پێغەمبەری خوادا ﷺ سنووردار نەبووە، بەڵکو ئەم دینە واقیعیە و دەکرێت مرۆڤەکان پەیڕەوی بکەن، نموونەی یەکەمیشی لە هاوەڵاندا خۆی دەبینێتەوە.

سێیەم: کۆی ئەم دینەی ئێستا ئێمەی موسڵمان پێوەی پابەندین، لەلایەن هاوەڵانەوە بەدەستمان گەیشتووە، گرنگە شتێك لەبارەی ژیان و بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتیانەوە شارەزا ببین، بزانین ئایا ئەم پەیامەمان لە کەسانی سەرڕاست و ژیرەوە وەرگرتووە؟ یان تەمەنێکە لەخشتەبراوین و بە ناحەق پابەندی ئایینێك کراوین کە کەسانێك بە ویستی خۆیان دایانڕشتووەو سەپاندوویانە.

لەم نووسینەدا، تەنها چەند نموونەیەکمان وەرگرتووە، خوێنەری ئازیز دەتوانێت لەم نموونانەوە بەرچاوڕوونییەکی زیاتری هەبێت و خۆی بەدوای دەیان ناونیشان و سەرەباسی تردا بگەڕێت بۆ ژیانی ڕۆژانەی خۆی سوودیان لێ وەربگرێت.

ئەم نووسینە لەلایەکەوە هەوڵێکە بۆ دانەوەی مشتێك لە کۆگایەکی قەرزاریمان لە ئاست هاوەڵان، هیوایەکیشە بۆ پێشەنگیکردن بە کەسانێکەوە کە بە دەقی قورئان خوای گەورە ڕازیبوونی خۆی بۆیان نیشان داوە، ئاواتێکە بۆ سەرهەڵدانەوەی نەوەیەکی نوێی موسڵمان کە بتوانن جارێکی دی پەیامی خوا لە دڵ و واقیع و خاکی سەرزەویدا پیادە بکەن.

## (ئەبووبەکری صدیق) (رضي الله عنه)

ناوی عەبدوڵای کوڕی عوثمانی کوڕی عامیری کوڕی عەمری قوڕەیشی تەیمیە، کونیەکەی ئەبووبەکرەو بە صدیق ناسراوە، نزیکترین و ئازیزترین هاوەڵی پێغەمبەری خوایە(صلی الله علیه وسلم) و یەکێکە لە موژدەپێدراوانی بەهەشت و یەکەم خەلیفەی راشیدینە، ئەبووبەکر بە هەریەك لە عەتیق و صدیق ناسرابوو.

ئەبووبەکر دوو ساڵ و نیو پاش ساڵی فیل لەدایك بوو.

ئەبووبەکر کەسێکی لەڕی بالآبەرزی سپی پێست بوو، دەموچاوی قەڵەو نەبوو، خەنەوسمەی بەکاردەهێنا.

بنەماڵەکەی باوکی ناوی عوثمانەو بە ئەبووقوحافە ناسراوە، لە فەتحی مەککەدا ئەبووبەکر باوکی برد بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بینی، فەرمووی با وازت بهێنایە لەو پیرە لە ماڵ خۆی بوایە من دەهاتم بۆ لای، ئەوەبوو ئەبووقوحافە موسڵمان بوو، دواتر لە ساڵی چواردەی کۆچی و لە تەمەنی نەوەدو حەوت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

دایکی ناوی سەلمای کچی صەخری قورەیشیە، زیاتر بە ئوممولخەیر ناسراوە، ئەم ئافرەتە زۆر زوو موسڵمان بوو، لە مەککە بون کە ئەبووبەکر وتی ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) ئەوە دایکمەو تۆیش پیرۆزیت، نزای بۆ بکە و بانگی بکە بۆ ئیسلام، بەڵکو خوا بە هۆی تۆوە لە دۆزەخ رزگاری بکات، پێغەمبەریش (صلی الله علیە وسلم) بانگەوازی دایکی کرد، ئەویش موسڵمان بوو،

ئوممولخەیر ژیا تا مەرگی ئەبووبەکری کوڕی بینی و لە میراتی ئەبووبەکریشی بەرکەوت، رایەکیش دەڵێت بەڵکو پێش مەرگی ئەبووبەکری کوڕی وەفاتی کرد.

**هاوسەرەکانی:** قوتەیلەی کچی عەبدولعوززا کە دایکی عەبدوڵا و ئەسمائی کچی ئەبووبەکر بوو، ئوممورومان کە دایکی عائیشەو عەبدوڕەحمان بوو، ئەسمائی کچی عومەیس کە دایکی موحەممەد بوو، حەبیبەی کچی خاریجە کە باوکی مارەی کرد لە ئەبووبەکری صدیق، ئەبووبەکریش لەم ئافرەتە منداڵێکی بوو بە ناوی ئومموکلثوم، ئەبووبەکر لە سەرەمەرگدا بوو کە حەبیبەی کچی خاریجە سکی هەبوو بەو کچەیەوە.

منداڵەکانی کوڕێکی ناوی عەبدوڵا بوو، کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ئەبووبەکر کۆچیان کرد بەرەو مەدینە، عەبدوڵا دەچوو هەواڵی قورەیشیەکانی دەبرد بۆیان، ئەوکات گەنجێك بوو، عەبدوڵا لە غەزاکانی فەتحی مەککەو حونەین و طائیفدا بەشداری کرد و برینداریش بوو، ئەو برینەی مایەوە تا لە سەردەمی خیلافەتی باوکیدا لە مانگی شەووالی ساڵی یانزەی کۆچیدا وەفاتی کرد.

کوڕێکی تری ناوی عەبدوڕەحمان بوو، ئەمیش هاوەڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو و موحەممەدی کوڕیشی هاوەڵ بوو، عەبدوڕەحمان بە بێباوەڕی بەشداری بەدرو ئوحودی کرد، دواتر لە حودەیبییەدا موسڵمان بوو، لە سەردەمی خیلافەتی باوکیدا بەشداری جەنگی یەمامەی کرد و حەوت گەورە سەرکردەی بێباوەڕانی کوشت، پاشان بەشداری فتووحات بوو، لە جەنگی جەمەلدا هاوشانی عائیشەی خوشکی بەشدار بوو، دواجار لە ساڵی پەنجاو سێ دا کۆچی دوایی کرد.

کوڕێکی تری ناوی موحەممەد بوو، ئەم منداڵەی لە حەجی ماڵئاواییدا لەدایك بوو، موحەممەد یەکێك بوو لە هێرش بەرانی سەر خەلیفە عوثمانی کوڕی عەففان، دواتریش کە میصری گرتە دەست لەگەڵ عەمری کوڕی عاص جەنگا و سوپاکەی موحەممەد شکا و دواتر کوژرا و سووتێنرا.

کچێکی ناوی ئەسما بوو، هەر زۆر زوو لە مەککە موسڵمان بوو و هاوسەری زوبەیری کوڕی عەووام بوو، کۆچی کرد بۆ مەدینەو سکی هەبوو بە عەبدوڵای کوڕی زوبەیرەوە، بە خاوەن دوو پشتێنەکە ناسراوە، تەمەنێکی زۆری کرد تا لە سەردەمی ئومەویدا دەسەڵاتی عەبدوڵای لە حیجاز بینی و مەرگی عەبدوڵای کوڕی بینی و پاش ماوەیەکی کەم لەو رووداوە وەفاتی کرد،

کچێکی تری ناوی عائیشە بوو کە بە دایکی باوەڕداران ناسراوەو خۆشەویستترین خێزانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو دوای وەفاتی خەدیجەو یەکێك بوو لە هاوسەرە زۆر شارەزاکانی.

کچێکی تری ناوی ئومموکلثوم بوو، ئەبووبەکر لە سەرەمەرگدا بوو کە حەبیبەی کچی خاریجە سکی هەبوو بەو کچەیەوە.

## ئەبووبەکر لە سەردەمی نەفامیدا ئەبووبەکر

لە سەردەمی نەفامیدا یەکێك بوو لە کەسایەتیە دیارەکان، سەرکردەیەکی ناو قورەیشیەکان بوو، بڕیاردەری قورەیشیەکان بوو، یەکێك بوو لەوانەی مەی لەسەر خۆی حەرام کردبوو و نەیدەخواردەوە، راوێژی زۆری پێ دەکرا.

ئەبووبەکر لە سەردەمی نەفامیشدا هاوەڵێکی نزیك و دۆستی هەمیشەیی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو.

خەڵکی مەککە زۆر تێکەڵی ئەبووبەکر دەبوون و لە دەوری بوون، چ لەبەر خۆشی کۆڕەکانی وقسەکردنی، چ لەبەر سەرقاڵبوونی بە کاری بازرگانی، چ لەبەر ئەو زانستەی کە هەیبوو.

موسڵمانبوونی ئەبووبەکری صدیق یەکەم کەس بوو موسڵمان بوو و یەکەم کەسیش بوو لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نوێژی کرد.

ئەبووبەکری صدیق یەکێك بوو لەو حەوت کەسە یەکەمەی کە لە مەککە ئیمانی خۆیان ئاشکراکرد، ئەوانیش بریتی بوون لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ئەبووبەکر و بیلال و صوهەیب و خەبباب و عەممار و سومەییە.

بانگەواز لە مەککەدا کاتێك ئەبووبەکر موسڵمان بوو یەکەم هەنگاوی ئەوەبوو چوو بۆ لای عوثمانی کوڕی عەففان و طهلحەی کوڕی عوبەیدوڵا و زوبەیری کوڕی عەووام و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و باسی ئیسلامی کرد بۆیان و بانگهێشتی کردن بۆ ئیسلام، هەموو ئەوانە موسڵمان بوون.

زوبەیری کوڕی عەوام لەسەر دەستی ئەبووبەکری صدیق موسڵمان بوو، چونکە ئەو پێشنیازی موسڵمان بوونی بۆ کرد و وردەکاری بانگەوازەکەی پێغەمبەری خوای(صلی الله علیه وسلم) بۆ خستەڕوو، زوبەیریش چوو بەدەم داواکەیەوەو موسڵمان بوو.

کاتێك ئەبووبەکر موسڵمان بوو، کەوتە بانگەواز کردن بۆ ئیسلام، بێباوەڕان لەسەر ئەوە زۆر لێیان دا، عوتبەی کوڕی ڕەبیعە بە نەعلەکانی دەیدا لە دەموچاوی و دەچووە سەر سکی ئەبووبەکر، ئیتر وای لێهاتبوو دەموچاوی ئەبووبەکر نەدەناسرایەوە، بەنوتیم هاتن و ئەبووبەکریان خستە ناو بەرگێکەوەو بردیانەوە ماڵەوە و بڕوایان وابوو بە دڵنیایەوە دەمرێت، باوکی ئەبووبەکر و بەنوتیم دەیاندواند و ئەویش وەڵامی دەدانەوە، دەیوت پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) چی لێ هات؟ ئەوانیش بە زمان هێرشیان دەکردە سەری و جێیاندەهێشت، ئینجا بە ئوموولخەیریان وت بزانە شتێکی نادەیتێ بیخوات، کەچی ئەبووبەکر بە دایکیشی هەمان شتی دەوت، پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) چی لێهات، ئەویش دەیوت بەخوا هەواڵی هاوەڵەکەتم نیە، ئەبووبەکر وتی بڕۆ بۆ لای ئوموجەمیلی کچی خەططاب و لای ئەو پرسیاری پێغەمبەری خوام (صلى الله علیه وسلم) بۆ بکە، ئوموولخەیر چوو بۆ لای ئوموجەمیلو وتی ئەبووبەکر داوای هەواڵی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵات لێ دەکات، ئەویش وتی من

ئەبووبەکر و موحەممەد ناناسم، ئەگەریش حەز دەکەیت لەگەڵت دێم بۆ لای کورەکەت، وتی بەڵێ، ئەوەبوو لەگەڵ ئوممولخەیر چوو بۆ ماڵی ئەبووبەکر و بینی لە چ بارێکدایە، ئوممو جەمیل دەستی کرد بە شیوەن و وتی بەخوا ئەوانەی وایان کردووە بە تۆ، فاسق و بێباوەڕن و داوام لە خوایە تۆڵەت لەوان بکاتەوە، ئەبووبەکر وتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چی لێهات؟

ئوممو جەمیل وتی ئەوە دایکتە، قسەکانمان دەبیستێت، ئەبووبەکر وتی ترست نەبێت لەو، ئوممو جەمیل وتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چاکەو سەلامەتە، ئەبووبەکر وتی لە کوێیە؟

وتی لە ماڵی ئیبنولئەرقەمە، ئەبووبەکر وتی دەی خوا ئاگادارە تا نەچم بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نە نان دەخۆم و نە ئاو دەخۆمەوە، ئوممو جەمیل و ئوممولخەیر وەستان تا خەڵکی بلاّوەیان کرد، ئینجا نەوینە ژێر باڵی و بردیان بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)،

کە گەیشتن بە یەکدی، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خۆی دا بەسەر ئەبووبەکردا و ماچی دەکرد و دڵی بۆی دەسووتا، ئەبووبەکر وتی ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوە دایکمەو تۆیش پیرۆزیت، نزای بۆ بکە و بانگی بکە بۆ ئیسلام، بەڵکو خوا بە هۆی تۆوە لە دۆزەخ رزگاری بکات، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بانگەوازی دایکی کرد، ئەویش موسڵمان بوو.

جارێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە پاڵ کەعبەدا نوێژی دەکرد کە عوقبە هات و جلەکەی خستە گەردنی و توندی کرد لە گەردنی، ئەبووبەکر هات و پشتی ملی گرت و لایبرد و پێی وت (أتقتلون رجلا أن يقول ربى الله) (پیاوێك دەکوژن کە دەڵێت خوا پەروەردگارمە).

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) رۆژانە بەیانی و ئێوارە سەردانی ماڵی ئەبووبەکری صدیقی دەکرد، جا کە موسڵمانان تووشی نارەحەتی بوون، ئەبووبەکر ویستی کۆچ بکات بۆ حەبەشە، لە نیوەڕێدا بوو کە ئیبنودوغنە پێی گەیشت و وتی ئەی ئەبووبەکر بۆ کوێ دەچیت؟ وتی

قەومەکەم دەریانکردوم و دەمەوێت بڕۆمە شوێنێ پەرستشی پەروەردگاری خۆم بکەم، ئەویش وتی کەسی وەك تۆ نابێت نە بچێت و نە دەربکرێت، تۆ پاڵپشتی نەبوان و خزم دۆست و میواندۆستیت، من دەبم بە پەنادەرت و بگەڕێرەوە لە شوێنی خۆت پەروەردگاری خۆت بپەرستە، ئەوەبوو ئەبووبەکر لەگەڵ ئیبنودوغنە گەڕایەوەو لە پاڵ کەعبەدا ئیبنودوغنە بە هەموانی راگەیاند کە پەنای ئەبوبەکری داوە، ئەبووبەکریش لەپاڵ ماڵی خۆیدا مزگەوتێکی دروست کرد و پەرستشی دەکرد و قورئانی دەخوێند و نوێژی تێدا دەکرد، ئافرەت و مندالآنی قورەیش دەهاتن و گوێیان لێدەگرت و تەماشایان دەکرد، ئەمەش قورەیشیەکانی ترساند، بۆیە ناردیان بۆ لای ئیبنودوغنەو داوایان لێکرد ئەو مزگەوتە بە ئەبووبەکر لاببات، ئەویش چوو و پێی وت یان پەرستشەکەت لە ماڵ بکەو یان پەناکەم بۆ بگێڕەوە، ئەبووبەکریش وتی بەڵکو پەناکەت بۆ دەگێڕمەوە و بە پەنای خوا و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) رازی دەبم، دوای ئەوە کۆچی موسڵمانان بەرەو مەدینە بە فەرمانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

دەستی پێکردو ئەبووبەکریش خۆی ئامادە کرد تا کۆچ بکات، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو (پەلە مەکە، من هیوام وایە مۆڵەتی منیش بدرێت)، ئەبووبەکر وتی بەباوکمەوە بەقوربانت بم هیوای ئەوە هەیە؟ فەرمووی بەڵێ، بۆیە ئەبووبەکر لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مایەوە تا هاودەمی بکات، بەردەوام دو سواری بەستبوویەوەو ماوەی چوار مانگ خزمەتی ئەو سوارانەی دەکرد تا ئامادە بن بۆ کۆچکردنی هەردووکیان.

ئەبووبەکری صدیق سامانێکی زۆری هەبوو، بەڵام هەمووی بۆ سەرخستنی بانگەوازی ئیسلامی خەرج کرد.

طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا دەڵێت جارێك لە بازاڕی بوصرا بووم کە راهیبێك لە پەرستگاکەی خۆیدا بوو، وتی پرسیار بکەن لەم خەڵکە بزانن کەسیان تێدایە خەڵکی حەرەم بێت؟ منیش وتم بەڵێ من، وتی ئایا هێشتا ئەحمەد دەرنەکەوتووە؟ وتم ئەحمەد کێیە؟ وتی کوڕی عەبدوڵای کوڕی عەبدولموطەلیب، ئەوە شارەکەیەتی کە تیایدا دەردەچێت و کۆتای پێغەمبەرانە و لە حەرەم دەردەکەوێت و کۆچ

دەکات بۆ شاری دارخورما، وریابە زوو خۆتی پێ بگەیەنە، منیش قسەکانی چوویە دڵمەوەو خێرا گەڕامەوە بۆ مەککەو وتم هیچ روویداوە؟ وتیان موحەممەدی کوڕی عەبدوڵا باسی پێغەمبەرایەتی دەکات و ئەبووبەکریش شوێنی کەوتووە، منیش چوم تا خۆم گەیاند بە ئەبووبەکر و وتم ئایا شوێنی ئەو پیاوە کەوتویت؟ وتی بەڵێ، تۆیش بڕۆ شوێنی بکەوە چونکە بانگەواز بۆ حەق دەکات، منیش بەسەرهاتەکەم بۆ باسکرد، ئەبووبەکریش لەگەڵم هات بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) و لەوێ موسڵمان بووم و بەسەرهاتەکەشم بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) گێڕایەوەو ئەویش بەوە دڵخۆش بوو.

ئەبووبەکر لە پێناو خوادا ژمارەیەك کۆیلەی ئازاد کرد، لەوانە بیلالی حەبەشی و عامری کوڕی فوهەیرەو زیننیرەو نهدیەو کچەکەی و کەنیزەیەکی بەنی نەوفەل و ئومموعوبەیس.

زیننیره کەنیزەیەکی رۆمی بوو لای قورەیشیەکان کاتێك بانگەوازی ئیسلامی بیست زۆر زوو موسڵمان بوو، ئیتر ئەبووجەهل زۆر سزای دەدا، زیننیرەش خۆڕاگر بوو و وزای نەدەهێنا لە ئیسلام، دواجار خوای گەورە ئەبووبەکری صدیقی کردە هۆکار و ئەبووبەکر زیننیرەی کڕیەوەو رزگاری کرد.

## کۆچکردن بۆ مەدینە

دوای ئەوەی کۆچی موسڵمانان بەرەو مەدینە بە فەرمانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەستی پێکردو ئەبووبەکریش خۆی ئامادە کرد تا کۆچ بکات، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو (پەلە مەکە، هیوام وایە مۆڵەتی منیش بدرێت)، ئەبووبەکر وتی بەباوکمەوە بەقوربانت بم هیوای ئەوە هەیە؟ فەرمووی بەڵێ، بۆیە ئەبووبەکر لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مایەوە تا هاودەمی بکات، بەردەوام دو سواری بەستبوویەوەو ماوەی چوار مانگ خزمەتی ئەو سوارانەی دەکرد تا ئامادە بن بۆ کۆچکردنی هەردووکیان.

رۆژێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەرەو ماڵی ئەبووبەکر هات و کاتەکەی جیا بوو لە هاتنی رۆژانی تری، هاتە ژوورەوەو بە ئەبووبەکری فەرموو (ئەی ئەبووبەکر ئەوانەی لەلاتن بیانکەرە دەرەوە)، ئەبووبەکر وتی ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوانە کەسانی تۆن، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

فەرمووی(مۆڵەتم پێدراوە) واتە بۆ کۆچکردن، ئەبووبەکریش وتی ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە باوکمەوە بەقوربانت بم یانی من هاودەمت دەبم؟ فەرمووی بەڵێ، ئەبووبەکر وتی دەی یەکێك لەو دوو سوارە بۆ تۆ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی(بە پارە دەیبەم)، ئەوەبوو هەردوو سوارەکەیان چاك ئامادە کردن و ئەسمائیش پشتێنەکەی کرد بە دوو بەشەوە بۆ بەستنەوەی توێشووەکانیان، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ئەبووبەکر چوونە ئەشکەوتی ثەور و لەوێ سێ شەو مانەوە، عەبدوڵای کوڕی ئەبووبەکریش کە گەنجێك بوو بەیانیان زوو دەچوو بۆ لایان و دەگەڕایەوە بۆ مەککە هێشتا خەڵکی لەخەو هەڵنەسابوون، عامیری کوڕی فوهەیرەش بە بڕێك مەڕوماڵاتەوە دەیدا بە لایاندا و شیری پێدەدان، کاتێك لە ئەشکەوتەکە دەمانەوە ئەبووبەکر شوێنێکی ئامادە کرد بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تا لەوێدا بخەوێت،ئینجا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ئەبووبەکر کابرایەکی بەنی دیلیان بە کرێ گرتبوو تا بیانبات بۆ مەدینە، سوارەکانیان دابوو بەو و وادەیان

بوو دوای سێ شەو لای ئەشکەوتەکە یەك ببینن، ئەوەبوو لە وادەی خۆیدا هات و هەرسێیان هاودەم بە عامیری کوڕی فوهەیرە ڕێی کەنار دەریایان گرتەبەر.

کاتێك لە ئەشکەوتەکەدا بوو، بێباوەڕان بە دوایاندا دەگەڕان و هاتبوونە بەردەم ئەشکەوتەکە، ئەبووبەکر وتی جا ئەگەر یەکێکیان تەماشای بەرپێی خۆی بکات دەمانبینێت، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ئەی ئەبووبەکر گومانت بە دوان چیە کە سێیەمیان خودایە).

کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبووبەکری صدیق کۆچیان کرد بۆ مەدینە، عامیر هاوکاریان بوو، دەچوو بەدوای ئەواندا مەڕومالآتی دەلەوەڕاند تا شوێن پێیان دیار نەبێت، هەروەها شیری مەڕەکانی بۆ دەبردن، ئەمەش لەو ماوەدا بوو کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبووبەکر لە ئەشکەوتی ثهور بوون.

سوراقە دەڵێت کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبووبەکری صدیق کۆچیان کرد، نێردراوانی قورەیش هاتن بۆ لامان

و وتیان هەرکەس پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) یان ئەبووبەکر بکوژێت یان بەدیل بگرێت ئەوە پاداشت دەکرێت و پاداشتەکەشی هێندەی خوێن باییەکە، منیش لە کۆڕێکی بەنی مودلیجدا دانیشتبووم کە کابرایەکی مودلیجی هات و وتی ئەی سوڕاقە کەمێك پێش ئێستا دوو تارماییم لە کەناراوەوە بینی، سوراقە وتی زانیم ئەوانن، وتم ئەوە ئەوان نین، ئەوە فلآن و فلآن بون کە تۆ بینیوتن، دوایی کەمێك لە کۆڕەکەدا مامەوەو دواتر چوومەوەماڵەوەو فەرمانم کرد بە کەنیزەکەکەم تا ئەسپەکەم بۆ ئامادە بکات، رمەکەمم هەڵگرت و سوار وشترەکەم بووم، چووم تا نزیك بوومەوە لە پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) و ئەبووبەر، لەوێ ئەسپەکەم منی خست، هەستامەوەو دەستم برد بۆ کیفی تیرەکانم و تیرێکم دەرکرد و کردم بە دوو لەتەوە کەچی بەدڵی خۆم بۆ دەرنەچوو، سواری ئەسپەکەم بوومەوەو نزیك بوومەوە لێیان، گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) قورئانی دەخوێند و لای نەدەکردەوە، بەڵام ئەبووبەکر زۆر لای دەکردەوە، ئەوکات دوو دەستی ئەسپەکەم رۆچوون بەناو زەویداو تا

نیوەی لە زەویدا بوو، لەسەر ئەسپەکەم کەوتمە خوارەوە، تێم خوڕی و ئەسپەکەم هەستایەوە، بەڵام دەستەکانی نەدەهاتنە دەرەوە،کە ڕێك وەستایە سەرپێ بینیم دووکەڵێك لە ئاسمانەوە دیارە، هەمدی تیرێکم دەرکرد و لەتم کرد کەچی خراپەکەم بۆ دەرچوو، داوای پەنام کرد لێیان، ئەوانیش وەستان، سواری ئەسپەکەم بووم تا چوومە لایان، کە بینیم ئاوام بەسەرهات وتم بە دڵنیاییەوە دوارِۆژ بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەبێت، پێم وت هۆزەکەت پاداشتی خوێن بابیەکیان داناوە بۆ گرتن یان کوشتنت، ئینجا هەواڵ و باس چی هەبوو بۆم باسکردن، دواتر پێم وتن شمەك و پێویستی چییان دەوێت با لای من بیبەن، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تەنها داوای لێکردم زانیارییان بشارمەوەو نەهێڵم خەڵك پێیان بزانێت، منیش داوام لێکرد نامەیەکی پەنام بۆ بنووسێت، ئەویش فەرمانی کرد بە عامیری کوڕی فوهەیرەو ئەویش لە پارچە پێستەیەکدا بۆی نووسیم، دواتر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چوو، ئینجا سوراقە ئەو نووسینەی هەڵگرت تا ئەو کاتەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە طائیفەوە گەڕایەوە سوراقە چوو

بۆ لای و ئەو نامەی پێ نیشان دا، ئەوکات لە جەعرانە بوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی نزیك بەرەوە، ئەویش نزیك بوویەوەو موسڵمان بوو. ئەبووبەکر دەڵێت کاتێك سوراقە گەیشت پێمان وتم ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوە گەیشت پێمان، فەرمووی خەفەت مەخۆ خوامان لەگەڵە، کە تەواو نزیك بوویەوەو نزیکەی چەند رمێك دوور بوو لێمانەوە دەستم کرد بە گریان و وتم ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وا گەیشت پێمان، فەرمووی بۆچی دەگریت؟ وتم بەخوا بۆ خۆم ناگریم، بەڵکو بۆ تۆ دەگریم، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی خوایە بەو جۆرەی خۆت دەتەوێت دووری بخەرەوە لێمان، ئەوەبوو ئەسپەکەی تا لای سکی چوو بەناخی زەویدا و سوراقەش کەوتە خوارەوە، سوراقە وتی ئەی موحەممەد ئەزانم ئەمە کاری تۆیە، نزا بکە خوا رزگارم بکات، بەخوا مەرج بێت رێ لەوانەی دوای خۆم ون بکەم تا نەگەڕێن بەدواتدا، ئەوەش تیرەکانم تیرێکیان ببە، دەزانم دەدەیت بە لای وشتر و رانە مەڕەکانمدا لە فلاَنە شوێن، لەوێ چەندت پێویستە ببە، پێغەمبەر

(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی هیچ پێویستیمان نیە بە وشترەکانت، ئینجا پێغەمبەر (صلى الله عليه و
سلم) نزای بۆ کرد و سوراقەش گەڕایەوە بۆ لای هاوەڵەکانی خۆی.
کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ویستی کۆچ بکات بۆ مەدینە، طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا لە شامەوە جلی سپی ناوازەی هێنابوو، دوو جلی بە دیاری نارد بۆ ئەبووبەکر و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەوانیش ئەو جلانەیان پۆشی و بەو جلانەوە چوونە ناو مەدینە.

کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبووبەکری صدیق بەرەو مەدینە کۆچیان دەکرد ئەوسی کوڕی عەبدوڵایان بینی، ئەویش کۆیلەیەکی هەبوو بە ناوی مەسعوود، پێغەمبەری خوا و ئەبووبەکری صدیقی سواری وشترەکەی خۆی کرد و مەسعوودی نارد لەگەڵیاندا و داوای کرد بیانگەیەنێتە مەدینەو تا ئەو شوێنە لێیان جیا نەبێتەوە, ئەویش تا مەدینە هاودەمی کردن و دواتر گەڕایەوە.

کاتێك ئەبووبەکری صدیق چوویە مەدینە، لای خاریجەی کوڕی زەید دابەزی و لەوێ مایەوە.

کاتێك هاوەڵان کۆچیان کرد بۆ مەدینەو لەوێ مانەوە، هەریەك لە بیلال و ئەبووبەکری صدیق تووشی تا بوون، دەیوت نەفرینی خوا لە شەیبەی کوڕی رەبیعەو عوتبەی کوڕی رەبیعەو ئومەییەی کوڕی خەلەف چۆن لە خاکی خۆمانەوە دەریانکردین بۆ خاکی دەرد و نەخۆشی، دواتر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (اللهم حبب إلينا المدينة كحبنا مكة أو أشد اللهم بارك لنا في صاعنا وفي مدنا وصححها لنا وانقل حماها إلى الجحفة) (خوایە مەدینەمان لا خۆشەویست بکە وەك خۆشەویستیمان بۆ مەککە یان زیاتر لەوەش، خوایە بەرەکەت بخەرە رزق و رۆزیمانەوە و تەندروستی بکە بۆمان، تای مەدینەش بگوازەرەوە بۆ جوحفە).

## بەشداری لە غەزاکاندا

ئەبووبەکری صدیق لە هەموو غەزاکاندا بەشداری کرد و لە تاکە غەزایەکیشدا دوانەکەوت، تا ئەو کاتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کرد بەردەوام لە دەوری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو و دەست و دەم و دڵی بۆ ئیسلام خستبوویە کار.

کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەرچوو بۆ بەدر، پێش غەزاکە رای خەڵکی وەرگرت و فەرمووی راتان چیە؟ ئەبووبەکری صدیق وتی ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بیستوومانە ئەوان-قورەیش- لە فلآنە شوێنن، هەمدی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە خەڵکەکەی فەرموو راتان چیە؟ ئەمجار عومەری کوڕی خەططاب هەمان قسەی ئەبووبەکری کرد، هەمدی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)رای هاوەڵانی وەردەگرت و فەرمووی راتان چیە؟ ئینجا سەعدی کوڕی موعاذ قسەی کرد و وتی: (مەبەسەتت ئێمەیە، سوێند بەوەی رێزداری کردویت و قورئانی بۆ دابەزاندویت، من رێی

وام هەرگیز نەگرتوەتەبەر و شارەزاییم لێی نیە، بەڵام ئەگەر برۆی تا بیرکولغیماد لە یەمەن هاودەم بە تۆ دێین، ئێمە وەك ئەو بەنوئیسرائیلیانە نین کە بە مووسایان وت (اذهب أنت و ربك فقاتلا إنا هاهنا قاعدون) (خۆت و خواکەت بڕۆن بجەنگن، ئێمە لێرە دانیشتوین)، بەڵکو دەڵێین برۆ خۆت و پەروەردگارت بجەنگن و ئێمەش لەگەڵتاندا شوێنت دەکەوین، لەوانەیە تۆ بۆ شتێك دەرچوو بیت و خواش شتێکی تری هێنابێتە ڕێت، بزانە ئەوەی خوا بۆی داناویت کامەیە ئەوە بگرەبەر، چ پەتێکت دەوێت بیگەیەنەو چ پەتێکت دەوێت بیپچڕێنە، لەگەڵ کێ دەتەوێت ئاشتی بکەو دژایەتی کێت دەوێت بیکە، چەندەت دەوێت لە سامانمان ببە).

عەلی کوڕی ئەبووطالیب دەڵێت لە غەزای بەدردا عەریشێکمان – چادر یان کەپرێ- بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دروست کرد، وتمان کێ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)دەبێت بۆ ئەوەی کەس نزیکی نەکەوێت، کەس نەچوو، تەنها ئەبووبەکر نەبێت کە شمشێری

هەڵکرد و لەلای پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه وسلم) وەستاو پاسەوانی دەکرد.

دواتر لە جەنگەکەشدا لە کەنار پێغەمبەری خواوە(صلى الله عليه وسلم) بەشداری کرد، کە دواتر موسڵمانان سەرکەوتن و نزیکەی حەفتا کەسیان بەدیل گرت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) رای ئەبووبەکر و عومەری وەرگرت سەبارەت بە دیلەکان، ئەبووبەکر وتی ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ئەوانە لە هۆزی خۆت و ئامۆزایانی خۆتن، پێم وایە بە فیدیە ئازادیان بکەیت، بەوە ئەو دەستکەوتە دەبێت بە هێز بۆ ئێمە دژ بە بێباوەڕان، بەڵکو خوای گەورەش رێنموونیان بکات بۆ ئیسلام، عومەر وتی نابەخوا ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، من راکەی ئەبووبەکرم نیەو پێم وایە بدەین لە گەردنیان، عەلی عەقیل بگرێت و بدات لە گەردنی، منیش فلاَنە خزمی خۆم بگرم و بدەم لە گەردنی، ئەوانە رێبەرانی کوفرن، بەڵام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) راکەی ئەبووبەکری بەدڵ بوو، بۆ بەیانیەکەی عومەر چوو دەبینێت پێغەمبەر (صلى الله

علیه وسلم) و ئەبووبەکر دانیشتون و دەگرین، عومەر وتی ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆچی دەگرین؟ با ئەگەر کرا منیش بگریم و ئەگەریش گریانم بۆ نەهات بۆ گریانەکەی ئێوە بگریم، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی(بۆ ئەوە دەگریم کە هاوەڵەکانت وتیان با فیدیە وەربگرین لێیان، لە خوارووی ئەو درەختەوە-درەختێکی نزیك لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو- سزای ئەوانەم بۆ خرایەڕوو-) ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە(ما کان لنبی أن یکون له أسری...).

لە غەزای ئوحودیشدا ئەبووبەکر بەشداری کرد و یەکێك بوو لەوانەی لە کاتی نارەحەتی و بلاَوەکردنی موسڵمانانداا لە دەوری پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) مایەوە.

ئەبووبەکری صدیق دەڵێت کە خەڵکی لە ئوحوددا لە دەوری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بلاَوەیان کردبوو، یەکەم کەس من بووم چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، دەبینم کەسێك لە دەوری بەرگری لێدەکات، وتم دەی ئەوە طەلحە بێت بە

دایك و باوكمەوە بەقوربانی بم، دواتر بینیم لە دوایشەوە كەسێك دەتوت باڵندەیەو دەفڕێت هات، خێرا خۆی گەیاندە من، دەبینم ئەبووعوبەیدەیە، خێرا پێكەوە چووین بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و طەلحەش لەبەردەم پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) كەوتبوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی فریای براكەتان بكەون، تیرێك بەر تەوێڵی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و تیرێكیش بەر روومەتی كەوتبوو، ئەبووعوبەیدە وتی ئەی ئەبووبەكر سوێندت دەدەم بە خوا بهێڵە من لایبەرم، ئەوەبوو بە دەمی-ددانی- تیرەكەی گرت و هێواش هێواش دەریدەكرد و حەزی نەدەكرد پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئازاری پێ بگات، دواتر ویستم من ئەو تیرەكەی تر دەربكەم، كەچی هەمدی ئەبووعوبەیدە سوێندی دام و بەهەمان شێوە ئەوی دیكەشی دەركرد.

هەروەها ئەبووبەكر لە غەزاكانی بەنی نەضیر و بەنیلموصطەلەق و خەندەقیشدا بەشداری كرد.

لە غەزای خەندەقدا کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هات بۆ لای سەعد، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) باوەشی پێدا کرد و خوێن بەسەر پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) دەچۆڕا، کە ئەبووبەکر هات و ئەوەی بینی وتی وەی پشتی شکاوم، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی وس ئەی ئەبووبەکر، دواتر عومەر هات کە ئەو حاڵەی بینی وتی إنا لله و إنا إليه راجعون.

ئەبووبەکر لە رێککەوتنی حودەیبیەشدا بەشداری کرد و رۆڵێکی کارای هەبوو، بەتایبەت لە دەمکوتکردنی عوروەدا کاتێك وتەی نەشیاوی بەرامبەر بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وت.

کاتێك قورەیشیەکان پەیمانیان شکاند و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بڕیاریدا هێرش بباتە سەر مەککە و فەتحی بکات، ئەبووسوفیان هات تا رێککەوتنەکە درێژ بکاتەوە، کە چووە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەڵامی نەدایەوە، بۆیە چوو تکای لە ئەبووبەکر و عومەر و عەلی کرد تا لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سکاڵای بۆ بکەن.

کاتێك فەتحی مەککە کرا، ئەبووبەکر چوو باوکی هێنا بۆ مزگەوت، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی بینی، فەرمووی با وازت لەو پیرە بهێنایە لە ماڵ بوایە تا من بچوومایە بۆ لای، ئەبووبەکر وتی ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو شیاوترە بێت بۆ لات نەك تۆ بچیت بۆ لای، ئەوەبوو باوکی لە خزمەت پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) دانیشاند، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەستی هێنا بەسەر سنگیداو پێی فەرمو موسڵمان بە، ئەویش موسڵمان بوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کرد رەنگی سپی سەری ئەبووقوحافە بگۆڕن.

ئەبووبەکر لە غەزاکانی حونەین و طائیفدا بەشداری کرد، ئەوەی جێی گومان نیە ئەوەیە کە ئەبووبەکر تا کاتی وەفاتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە هەموو غەزاکاندا بەشدار بووە.

## ژیانی ئەبووبەکر لە مەدینە لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیە وسلم)

جارێك ئەبووسوفیان دای بەلای سەلمانی فارسی و بیلال و صوهەیب و چەند کەسێکی تردا، ئەوانیش تانەیان لێدا، ئەبووبەکر وتی ئەوە پیاوماقوڵی قورەیشە، وای پێ دەڵێن؟! دواتر ئەبووبەکر هات بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی(ئەی ئەبووبەکر لەوانەیە تووڕەت کردبن، ئەگەر ئەوانت تووڕە کردبێت ئەوە پەروەردگارتت تووڕە کردووە)، خێرا ئەبووبەکر چوویەوە بۆ لایان و وتی برا ئازیزەکانم ئەرێ ئێوەم تووڕە نەکرد؟ ئەوانیش وتیان نا ئەی ئەبووبەکر خوا لێت خۆش بێت.

رەبیعەی کوڕی کەعب دەڵێت پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) زەویەکی پێدام و زەویەکیشی دا بە ئەبووبەکر، رۆژان هات و رۆژان چوو تا رۆژێك لەسەر بنە دارخورمایەك لەگەڵ ئەبووبەکر کێشە کەوتە نێوانمانەوە، من وتم هی منەو ئەویش وتی هی منە، ئیتر قسەو

بۆڵەیەك کەوتە نێوانمانەوە تا ئەوەی ئەبووبەکر قسەیەکی ناخۆشی پێ وتم و خۆیشی خێرا لە قسەکەی پەشیمان بوو، ئەبووبەکر وتی ئەی رەبیعە ئەو قسەیەم پێ بڵێرەوە تا ببێتە تۆڵە، منیش وتم شتی وا ناکەم، ئەبووبەکر وتی بەخوا یان پێم دەڵێیتەوە یان لای پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) سکاڵات لێ دەکەم، منیش وتم هەرگیز پێت ناڵێمەوە، ئەبووبەکر چوو بۆ لای پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) و منیش بە دوایدا چووم، خەڵکێ لە ئەسلەم هاتن و وتیان رەحمەتی خوا لە ئەبووبەکر لەسەر چی تۆی هێناوە بۆ لای پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) لەکاتێکدا ئەو وای پێ وتوویت؟ منیش وتم دەزانن ئەوە کێیە؟ ئەوە ئەبووبەکری صدیقە، ئەوە دووەم کەسە لەگەڵ پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) – کە لە قورئاندا باس کراوە- ئەوە ریش سپی موسڵمانانە، وریا بن لا نەکاتەوەو وا بزانێت ئێوە هاتون بۆ پشتیوانی من، بەوە توورە دەبێت و دەچێتە لای پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) و ئەویش بۆ پشتیوانی ئەبووبەکر توورە دەبێت و خوای گەورەش لەبەر توورەیی ئەو دوانە توورە دەبێت و رەبیعەشماڵوێران دەبێت،

ئەوانیش وتیان ئەی ئەڵێیت چی بکەین؟ وتم بگەڕێنەوە، ئینجا ئەبووبەکر چوو بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و مەسەلەکەی بۆ باسکرد، منیش بە تەنیا چوومە خزمەتیان، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سەری بەرز کردەوە بەرووی مندا و فەرمووی: (ئەی رەبیعە تۆ و صدیق چ کێشەیەکتان هەیە؟) وتم ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مەسەلەکە ئاوەها و ئاوا بوو، دواتر قسەیەکی پێ وتم کە خۆیشی پێی ناخۆش بوو و دەڵێت: دەبێت پێم بڵێیتەوە تا ببێتە تۆڵە، منیش رازی نەبوم، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (بەڵێ پێی مەڵێرەوە، بەڵکو بڵێ خوا لێت خۆش بێت ئەی ئەبووبەکر)، منیش ئاوام وت، ئەبووبەکریش بە گریانەوە شوێنەکەی جێهێشت.

عومەری کوڕی خەططاب دەڵێت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی کرد بە خێرکردن، منیش سامانێکی زۆرم هەبوو، وتم بەخوا ئەمجار پێش ئەبووبەکر دەکەوم، بۆیە کردم بە دووبەشەوەو بەشێکیم برد، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی (ئەی عومەر ئەو

سامانە زۆرە؟ ئەی چیت بۆ خێزانەکەت جێهێشتووە؟) وتم نیوەی، ئینجا ئەبووبەکر هات و سامانێکی زۆری هێنا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی ئەی ئەبووبەکر ئەو سامانە زۆرە؟ ئەی چیت بۆ خێزانەکەت جێهێشتووە؟) وتی خواو پێغەمبەری خوام بۆ جێهێشتوون.

جارێك ئەبووبەکری صدیق چوو بۆ شام، هاودەم بەویش نوعەیمانی کوڕی عەمر کە هاوەڵێکی بەشداربووی عەقەبە و غەزای بەدریش بوو و بە کەسێکی قسەخۆش ناسرابوو، لەگەڵ سوەیبیطیشدا چوون، سوەیبیط سەرپەرشتی خواردنی کاروانەکەی دەکرد، نوعەیمان هات و وتی برێك خواردنم بدەرێ، سوەیبیط وتی نابێت، دەبێت ئەبووبەکر بێتەوە ئینجا، نوعەیمانیش چوو بۆ لای برێك خەڵك کە لەوێ بوون و وتی کۆیلەیەکی عەرەبم هەیە لێم بکڕن، بەڵام زمان درێژی دەکات و لەوانەیە کە بیهێنم پێتان بڵێت من کۆیلە نیم و ئازادم، جا ئەگەر بەو حاڵەیەوە لێم دەکڕن با بیهێنم، ئەگەرنا با نەیهێنم و کۆیلەکەشم لێ هار مەکەن، ئەوانیش وتیان بیهێنە دەیکڕین، ئەویش چوو سوەیبیطی هێنا

بەرەو لا خەڵکەکە، کە گەیشتنە ئەوێ بە خەڵکەکەی وت ئەوەتا ئەمەیە، ئەوانیش وتیان باشە دەیکڕین، سوەییبط وتی ئەمە درۆ دەکات من کەسێکی ئازادم و کۆیلە نیم، ئەوانیش وتیان ئاگامان لە فێڵت هەیە، ئەوەبوو بە حەبل بەستیانەوەو بردیان، کە ئەبووبەکر هاتەوەو هەواڵەکەی بیست، خێرا چوون و سوەیبیطیان کڕیەوەو هێنایانەوە، کە هاتنەوە بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و بەسەرهاتەکەیان بۆ باسکرد، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی تا ماوەیەك پێدەکەنین.

کاتێك حەفصە بێوەژن کەوت، عومەری باوکی بڕیاری دا مێردێکی باش بدۆزێتەوە بۆ کچەکەی، بۆیە پێشنیازی کرد بۆ ئەبووبەکر تا بەهاوسەری بگرێت، بەڵام ئەبووبەکر ڕەزامەندی دەرنەبڕی، ئینجا پێشنیازی کرد بۆ عومەر، ئەویش ڕەزامەندی دەرنەبڕی و وتی بڕوام نیە بتوانم ئەم ماوە ژن بهێنم، عومەریش بەوە دڵتەنگ بوو و جۆرێك لە بێتاقەتی ڕوی تێکرد و چوو لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سکاڵای کرد کە چی ڕوویداوە، ئەویش

فەرمووی: (يتزوج حفصة من هو خير من عثمان و يتزوج عثمان من هي خير من حفصة)، (کەسی باشتر لە عوثمان حەفصە بەهاوسەر دەگرێت و عوثمانیش کەسی باشتر لە حەفصە بەهاوسەر دەگرێت)، ئەوەبوو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) داوای حەفصەی کرد و بەهاوسەری گرت، دواتر کە ئەبووبەکر عومەری بینی وتی دڵت شتێك نەکات بەرامبەرم، من بیستبووم کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) باسی حەفصەی دەکرد، بۆیە –ئەمەشم پێ نەوتیت- وتم با نهێنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئاشکرا نەکەم، بە دڵنیاییشەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) حەفصەی بەهاوسەر نەگرتایە من داوام دەکرد و بەهاوسەرم دەگرت.

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت ئەبووبەکر هاتە ژوورەوە بۆ لام و دوو کچۆڵەم لا بوون کە دەفیان لێدەدا، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بە جلەکانی خۆی داپۆشیبوو، ئەبووبەکر هەڵشاخی پیایاندا، ئەوەبوو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) جلەکانی لەسەر دەموچاوی لابرد و فەرمووی(دعهما يا أبابكر فإنها أيام عيد و تلك الأيام

أيام منى)، (وازیان لێ بێنە ئەی ئەبووبەکر، چونکە ئەم ڕۆژانە ڕۆژانی جەژنن و ڕۆژانی مینان).

جارێك ئەبووبەکر میوانداری دەستەیەکی کرد و بە عەبدوڕەحمانی کوڕی وت میوانەکانت ببە وا من دەچم بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، تا دێمەوە خزمەتیان بکە، عەبدوڕەحمانیش چوو و چی هەبوو داینا بۆیان و وتی بخۆن، ئەوانیش وتیان ئەی گەورەی ماڵ لە کوێیە؟ عەبدوڕەحمان وتی نانەکەتان بخۆن، ئەوانیش وتیان نان ناخۆین تا گەورەی ماڵ نەیەتەوە، ئەویش وتی خزمەتمان قبووڵ بکەن، بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون، عەبدوڕەحمان زانی باوکی بێتەوە تووڕە دەبێت، بۆیە کە ئەبووبەکر هاتەوە عەبدوڕەحمان ماوەیەك خۆی ون کرد، دواتر ئەبووبەکر بە میوانەکانی وت چیتان کرد؟ ئەوانیش وتیان چی بووە؟ ئەبووبەکر وتی ئەی عەبدوڕەحمان، ئەویش بێدەنگ بوو و وەڵامی نەدایەوە، هەمدی بانگی کرد و ئەویش وەڵامی نەدایەوە، ئەبووبەکر تووڕە بوو و قسەیەکی پێ وت و وتی سوێندت دەدەم ئەگەر دەنگم دەبیستیت وەڵامم بدەرەوە، عەبدوڕەحمان هاتە دەرەوەو

وتی پرسیار لە میوانەکانت بکە، ئەوانیش وتیان راست دەکات، خزمەتی کردین، ئەبووبەکر وتی یانی چاوەڕوانی من بوون؟ بەخوا ئەمشەو نان ناخۆم، ئەوانیش وتیان دەی بەخوا تا تۆ نان نەخۆیت ئێمەش نان ناخۆن، ئەبووبەکر وتی شەوی وەك ئەمشەو خراپم نەدیوە، ماڵوێرانان چیتانە؟ بۆچی میوانداری و خزمەتمان قبووڵ ناکەن؟ عەبدوڕەحمان خواردنەکە بهێنە، ئەوەبوو خواردنەکەی هێنا و ئەبووبەکر بیسمیلاهی کرد و لێی خوارد و ئەوانیش دەستیان کرد بە خواردن، بۆ بەیانی ئەبووبەکر چوو بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و بەسەرهاتەکەی بۆ باسکرد و وتی ئەوان سوێندەکەیان بردە سەر و من سوێندەکەم خست، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی (بەڵکو تۆ بەوەفاتر بوویت بە سوێندەکەت و چاکترینیان بوویت).

حەنظەلە دەڵێت جارێك ئەبووبەکر دای بە لامداو وتی ئەی حەنظە لە حاڵت چۆنە؟ وتم حەنظەلە توشی دووڕوویی بووە، ئەویش وتی سوبحانەڵا ئەوە چی دەڵێیت؟ منیش وتم: کاتێك لای پێغەمبەری

خواین (صلی الله علیه وسلم) کە باسی دۆزەخ و بەهەشتمان بۆ دەکات وا دەزانین لەبەرچاومانەو بە چاوی خۆمان ئەو شتانە دەبینین، کەچی کە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەڕۆین گەمەو بەزمی ژن و منداڵ و بژێوی ژیان سەرقاڵمان دەکات و زۆر شتمان بیر دەچێتەوە، ئەبووبەکریش وتی دەی بەخوا ئێمەش هەر واین، بۆیە لەگەڵ ئەبووبەکر چووین بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و وتم ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) حەنظەلە تووشی نیفاق بووە، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی چی بووە؟ وتم ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کاتێك لای تۆین کە باسی دۆزەخ و بەهەشتمان بۆ دەکەیت وا دەزانین لەبەرچاومانەو بە چاوی خۆمان ئەو شتانە دەبینین، کەچی کە لای تۆ دەڕۆین گەمەو بەزمی ژن و منداڵ و بژێوی ژیان سەرقاڵمان دەکات و زۆر شتمان بیر دەچێتەوە، پێغەمبەری خوایش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی (والذي نفسي بيده إن لو تدومون على ما تكونون عندي، وفي الذكر، لصافحتكم الملائكة على فرشكم وفي طرقكم، ولكن يا حنظلة ساعة و

ساعة)، (سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، ئەگەر لەسەر ئەو بارە بەردەوام بن کە لای منن و لە زیکر بەردەوام بن، ئەوە فریشتەکان لەسەر جێگەکانتان و لە سەرە ڕێکانتاندا تەوقەتان لەگەڵ دەکەن، بەڵام ئەی حەنظەلە ساتەو ساتە)، سێ جار ئەمەی فەرموو.

جابیر دەڵێت جارێك نەخۆش بووم، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبووبەکر بە پیادەو بێ سوار هاتن بۆ سەردانم.

جارێك جوبەیر لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو کە ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کرد بە ئافرەتەکە جارێکی تر بێتەوە بۆ لای، ئافرەتەکە وتی ئەی ئەگەر هاتمەوەو تۆم نەبینی؟ وەك ئەوەی بڵێت ئەگەر مردبوویت، ئەویش فەرمووی: (إن لم تجديني فأتي أبابكر)،(ئەگەر منت بەدی نەکرد وەرە بۆ لای ئەبووبەکر).

شافیعی دەڵێت ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خەلیفەی دوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەبووبەکرە.

ئەسمائی کچی ئەبووبەکر دەڵێت لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چووین بۆ حەج تا گەیشتینە عەرج، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دابەزی و عائیشە لەکەنار پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه وسلم) دانیشت، منیش لەپاڵ باوکمەوە دانیشتم، کۆڵ و توێشووی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ئەبووبەکر یەکێك بوو و بە خزمەتکارێکی ئەبووبەکر بوو، ئەبووبەکر دانیشت و چاوەڕێی ئەو خزمەتکارە بوو بگات، ئەوەبوو خزمەتکارەکە دەرکەوت و وشترەکەی پێ نەبوو، ئەبووبەکر وتی کوا وشترەکەت؟ خزمەتکارەکە وتی دوێنێ شەو ونم کرد، ئەبووبەکر وتی یەك وشترت پێ بوو و ونت کرد؟ ئیتر کەوتە لێدانی، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بزەی دەکرد و دەیفەرموو (انظروا إلى هذا المحرم وما يصنع)، (تەماشای ئەم ئیحرام بەستووە بکەن چی دەکات).

ئەبووسەعید کە بەشدار بوو لە حەجی ماڵئاواییدا، دەڵێت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وتاری دا و فەرمووی (خوای گەورە بەندەیەکی سەرپشك کرد لەنێوان دنیا و ئەوەی لای خوا بێت، ئەویش

ئەوەی لای خوای هەڵبژارد)، ئەبوبەکر کە ئەوەی بیست دەستی کرد بە گریان، منیش وتم ئەم پیاوە بەتەمەنە بۆچی دەگری؟ بەڵام دواتر تێگەیشتم کە ئەبوبەکر لە هەمووومان شارەزاتر بوو، ئەو بەندەیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو.

ئبن عەبباس دەڵێت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە کاتی نەخۆشیەکەیدا بە پارچە قوماشێك سەری بەستبوو، چوویە سەر مینبەر و سوپاس و ستایشی خوای کرد و دواتر فەرمووی: (إنه ليس من الناس أحد أمن علي في نفسه وماله من أبي بكر بن أبي قحافة، ولو كنت متخذا من الناس خليلا لاتخذت أبا بكر خليلا، ولكن خلة الإسلام أفضل، سدوا عني كل خوخة في هذا المسجد، غير خوخة أبي بكر)، (کەس نیە بەهۆی گیان و سامانیەوە منەتباری بم جگە لە ئەبووبەکری کوڕی قوحافە، ئەگەر من دۆستی زۆر نزیکم لەنێو خەڵکدا بگرتایە، بە دڵنیایەوە ئەبووبەکر دەبوو، بەڵام هاودەمی ئیسلام باشترە، لەم مزگەوتەدا چی خێمە هەیە بەرووومدا دایخەن جگە لە خێمەکەی ئەبووبەکر).

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە کۆتا رۆژەکانی تەمەنیدا بوو، رۆژی چوارشەممەکەی تاو نارەحەتی پێغەمبەری خوای(صلی الله علیه وسلم) داگرت، بەڵام رۆژی پێنج شەممە خۆی چوو ئاڵاکەی دایە دەست ئوسامەی کوڕی زەید تا هێرش ببەنە سەر رۆم، لەنێو سوپاکەیدا ئەبووبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەطاب و ئەبوو عوبەیدەی کوڕی جەراح و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و چەندین هاوەڵی تری گەورە هەبوون.

عەبدوڵای کوڕی زەمعە دەڵێت کاتێك نەخۆشیەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زۆری بۆ هێنا، منیش هاودەم بە ژمارەیەك لە موسڵمانان لەلای بووم، بیلال بانگی دا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی کەسێك بنێرن نوێژ بکات بۆ خەڵکەکە، منیش چووم بینیم عومەر لەناو خەڵکەکەدایەو ئەبووبەکر لەوێ نیە، وتم ئەی عومەر نوێژ بکە بۆ خەڵکەکە، عومەریش هەستا، کە الله اکبری کرد، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەنگی بیست هەواڵی ئەبووبەکری پرسی، ئەوەبوو دوای ئەوە ئەبووبەکر نوێژی کرد بۆ

موسڵمانان، دواتر عومەر پێی وتم ماڵوێران ئیبن زەمعە چیت پێکردم، بەخوا کە وتت بەرنوێژی بکە، وامزانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی ئەوەی پێکردویت، ئەگەر وا تێنەگەیشتمایە بەرنوێژیم نەدەکرد بۆ خەڵکەکە، منیش وتم بەخوا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێنەکردم، بەڵام کە ئەبووبەکرم نەبینی، ئیتر تۆم بە شیاوتر زانی.

سالیمی کوڕی عوبەید باسی ساتەکانی نەخۆشی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەکات و دەڵێت: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەخۆش کەوت و لەهۆش خۆی چوو، دواتر هاتەوە هۆش خۆی، فەرمووی ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟ منیش وتم بەڵێ، فەرمووی بە بیلال بڵێن با بانگ بدات، بە ئەبووبەکریش بڵێن با بەرنوێژی بۆ خەڵك بکات، هەمدی لە هۆش خۆی چوو، دواتر هاتەوە هۆش خۆی، فەرمووی ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟ منیش وتم بەڵێ، فەرمووی بە بیلال بڵێن با بانگ بدات، بە ئەبووبەکریش بڵێن با بەرنوێژی بۆ خەڵك بکات، هەمدی لەهۆش خۆی چوو، دواتر هاتەوە هۆش خۆی، عائیشە

وتی باوکم کەسێکی دڵناسکەو زوو گریان دایدەگرێت، بەڵکو کەسێکی تر بنێریت بۆ بەرنوێژی، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەمدی فەرمووی ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟ وتمان بەڵێ، فەرمووی بە بیلال بڵێن با بانگ بدات، بە ئەبووبەکریش بڵێن با بەرنوێژی بۆ خەڵك بکات، هەمدی عائیشە وتی باوکم کەسێکی دڵناسکەو زوو گریان دایدەگرێت، بەڵکو کەسێکی تر بنێریت بۆ بەرنوێژی، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی (ئێوەی ئافرەتان هاودەمە ژنەکانی یووسفن، بە بیلال بڵێن با بانگ بدات و بە ئەبوبەکریش بڵێن با بەرنوێژی بکات بۆ خەڵك)، هەمدی لەخۆش خۆی چوو، بیلال بانگی دا و قامەتی کرد و ئەبووبەکریش چوو بەرنوێژی بکات بۆ خەڵکەکە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هاتەوە هۆش خۆی و فەرمووی ئایا نوێژ دابەسراوە؟ وتم بەڵێ، فەرمووی (کەسێکم بۆ بانگ بکەن تا خۆمی پێوە بگرم)، ئەوەبوو بەریرەو کەسێکی تر هاتن و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) باڵی دایە سەر شانیان و بەو حاڵەوە چوو بۆ نوێژ، لەپاڵ ئەبووبەکردا

دانیشێنرا، ئەبووبەکر ویستی بگەڕێتە دواوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەبووبەکری هێشتەوە تا نوێژەکە تەواو بوو.

دواتر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەفاتی کرد، عومەر تووڕە بووبوو دەیوت هەرکەس بڵێت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەفاتی کردووە بەم شمشێرە دەدەم لە گەردنی، خەڵکەکە بێدەنگ بوون، وتیان ئەی سالیم بڕۆ بۆ لای هاوەڵەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و بانگی بکە، منیش چووم بینیم ئەبووبەکر لە مزگەوت وەستاوە، کە منی بینی وتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەفاتی کرد؟ منیش وتم عومەر دەڵێت هەرکەس بڵێت وەفاتی کردووە ئەوە بەم شمشێرەم دەدەم لە گەردنی، ئەبووبەکر دەستی خستە سەر شانم و کەوتە ڕێ تا هاتە ژوورەوەو خەڵکەکە ڕێیان بۆ کردەوە تا گەیشتە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و خۆی دا بەسەریدا و دەموچاوی خستەڕوو و دەستی دا لە دەموچاوی و دڵنیا بوو وەفاتی کردووە، ئینجا ئەو ئایەتەی خوێندەوە(إنك میت و إنهم میتون)،

خەڵکەکە وتیان ئەی هاوەڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئایا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەفاتی کردووە؟ وتی بەڵێ...

کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەفاتی کرد، ئەبووبەکر پێغەمبەری خوای(صلی الله علیه وسلم) ماچ کرد،

ئەوەبوو کە هاتە ژوورەوەو بینی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەفاتی کردووە، ماچی کرد و فەرمووی بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم، بە زیندوویی و مردووییش بۆنت خۆشە، سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە خوا هەرگیز دوو مەرگت پێ نۆش ناکات، دواتر چووە دەرەوەو هەواڵی مەرگی پێغەمبەری خوای(صلی الله علیه وسلم) بە خەڵکەکە گەیاندو پێی وتن هەرکەس موحەممەدی دەپەرست ئەوە موحەممەد مرد، هەرکەسیش خوا دەپەرستێت ئەوە خوا زیندووەو نامرێت، چەند ئایەتێکی خوێندەوەو خەڵکیش دەستیان کرد بە گریان.

## پلەوپایەی ئەبووبەکر لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

ئەبووبەکر یەکێکە لە موژدەپێدراوانی بەهەشت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو (أبو بكر في الجنة، وعمر في الجنة، وعثمان في الجنة، وعلي في الجنة، وطلحة في الجنة والزبير في الجنة، وعبد الرحمن بن عوف في الجنة، وسعد في الجنة، وسعيد في الجنة، وأبو عبيدة بن الجراح في الجنة) (ئەبووبەکر لە بەهەشتە، عومەر لە بەهەشتە، عوثمان لە بەهەشتە، عەلی لە بەهەشتە، طهلحە لە بەهەشتە، زوبەیر لە بەهەشتە، عەبدورەحمانی کوڕی عەوف لە بەهەشتە، سەعد لە بەهەشتە، سەعید لە بەهەشتە، ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراح لە بەهەشتە).

ڕۆژێك موغیرە لای سەعیدی کوڕی زەید قسەی بەرامبەر بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب کرد، سەعید هەستاو وتی من شایەتی دەدەم بیستم لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو (عشرة في الجنة: النبي في الجنة، وأبو بكر في الجنة، وعمر في الجنة، وعثمان في الجنة،

وعلي في الجنة، وطلحة بن عبيد الله في الجنة، والزبير بن العوام في الجنة، وسعد بن مالك في الجنة، وعبد الرحمن بن عوف في الجنة)، (دە کەس لە بەهەشتدان: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە بەهەشتدایە، ئەبووبەکر لە بەهەشتدایە، عومەر لە بەهەشتدایە، عوثمان لە بەهەشتدایە، عەلی لە بەهەشتدایە، طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا لە بەهەشتدایە، زوبەیری کوڕی عەووام لە بەهەشتدایە، سەعدی کوڕی مالیك لە بەهەشتدایە، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف لە بەهەشتدایە)، ئینجا زەید وتی بمویستایە کەسی دەیەمیشم دەوت، وتیان کێیە؟ بێدەنگ بو، دواتر زۆریان لێکرد تا بیلێت، ئەویش وتی سەعیدی کوڕی زەید-واتە خۆی-

زەید دەڵێت جارێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) منی نارد و فەرمووی(بڕۆ بۆ لای ئەبووبەکر دەبینیت لەماڵی خۆیەو لەسەر کۆش دانیشتووەو خۆی کۆکردوەتەوە، پێی بڵێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەلامت لێ دەکات و پێت دەفەرموێت موژدەی بەهەشتت لێ بێت)

جارێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر کێوی حیرا وەستابوو، کێوەکە لەریەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ئارام بگرە حیرا ، چونکە ئەوەی بەسەرتەوەیە یان پێغەمبەرە یان صدیقە یان شەهیدە)، ئەو دەمەش هەریەك لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبووبەکر و عومەر و عوثمان و عەلی و طەلحەو زوبەیر و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص لەسەر کێوەکە بوون.

جارێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە حەسسانی فەرموو ئایا سەبارەت بە ئەبووبەکر هیچ شیعرت وتووە؟ ئەویش وتی بەڵێ، فەرمووی بیڵێ تا بیبیستم، ئەویش وتی:

وثاني اثنين في الغار المنيف وقد طاف العدو به إذ صعد الجبلا

وكان حب رسول الله قد علـــموا من البريـــة لم يعدل به رجــلا

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە ئەوەی بیست پێکەنی تا دانەکانی پێشەوەی دەرکەوت، پاشان فەرمووی راستت وت ئەی حەسسان، هەروایە کە تۆ وتووتە.

عەمری کوڕی عاص دەڵێت پرسیار کرا لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کێ زۆر لات خۆشەویستە؟ فەرمووی عائیشە، وتیان ئەی لەپیاوان؟ فەرمووی ئەبووبەکر، وتیان دواتر، فەرمووی عومەر، وتیان دواتر، فەرمووی ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراح.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەیفەرموو (ئەبووبەکر پیاوێکی زۆر چاکە، عومەر پیاوێکی زۆر چاکە، ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراح پیاوێکی زۆر چاکە، ثابتی کوڕی قەیس پیاوێکی زۆر چاکە، موعاذي کوڕی عەمر پیاوێکی زۆر چاکە، موعاذی کوڕی جەبەل پیاوێکی زۆر چاکە، سەهلی کوڕی بەیضاء پیاوێکی زۆر چاکە).

عەبدوڵای کوڕی حەنطەب دەڵێت لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بووم کە تەماشایەکی ئەبووبەکر و عومەری کرد و فەرمووی(ئەو دوانە چاو وگوێن).

## کۆبوونەوەی بەنی ساعیدە

کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەفاتی کرد پشتیوانان لە کەپری بەنی ساعیدە کۆبوونەوە، ئەوان لە دەوری سەعدی کوڕی عوبادە کۆبوونەوە، پشتیوانان پێیان وابوو دەبێت ئەوانیش پشکی خیلافەتیان هەبێت، ئینجا ئەبوبەکر و عومەر و ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراح کە هەواڵەکەیان زانی، چوون بۆ لای پشتیوانان، پشتیوانان دەیانوت با ئێمە ئەمیرێکمان هەبێت و ئێوەش ئەمیرێکتان هەبێت، ئەبوبەکر قسەی کرد و وتەکانی هەموویانی قەناعەت پێکرد، لە میانەی وتەکانیدا وتی ئەمیرایەتی لە ئێمەو وەزیری لە ئێوە، بەڵام حوبابی کوڕی مونذیر وتی نابەخوا، ئەمیرێك لە ئێوەو ئەمیرێك لە ئێمە، ئەبوبەکر تێیگەیاند کە بۆچی وای وتووە، پاشان وتی بەیعەت بدەن بە عومەر یان بە ئەبوعوبەیدە، خێرا عومەر وتی بەڵکو بەیعەت بە تۆ دەدەین و تۆ گەورەو چاکترینمانیت، لە هەموومان لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خۆشەویستتر بوویت، عومەر دەستی ئەبوبەکری گرت و بەیعەتی پێدا و خەڵکەکەش بەیعەتیان پێدا.

## بەیعەتدان بە ئەبووبەکر

مێژوو نووسی شیعە یەعقووبی دەقێکی هێناوەو دەڵێت: دەستەیەك لە کۆچەران و پشتیوانان لە بەیعەت دان بە ئەبووبەکر دواکەوتن و هەواداری عەلی کوڕی ئەبووطالیب بوون، لەوانە عەبباسی کوڕی عبدولموطهلیب و فەضلی کوڕی عەبباس و زوبەیری کوڕی عەووام و خالیدی کوڕی سەعید و میقدادی کوڕی عەمر و سەلمانی فارسی و ئەبووذەری غیفاری و عەمماری کوڕی یاسر و بەررائی کوڕی عازب و ئوبەی کوڕی کەعب.

ئەم مەسەلەیە پەیوەست کراوە بە ناکۆکی نێوان شیعەو سوننە لەسەر مەسەلەی خیلافەت و ئیمامەت، شیعە پێیان وایە ئیمامەت لە دوای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە میراتی بۆ عەلی و نەوەکانی ماوەتەوە تا ڕۆژی دوایی و ئەبووبەکر و هاوەڵانی تر ئەو مافەیان لێ زەوت کردووە، سوننەش پێیان وایە هیچ بنەڕەتێك نیە بۆ مەسەلەی

ئیمامەتی عەلی و خیلافەتی ئەبووبەکریش دروست بووە و هەموو موسڵمانانیش لەسەری کۆدەنگ بون.

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە ئەگەر ئیمامەت بەشێکی چەسپاوی بیروباوەڕەو مافی عەلی کوڕی ئەبووطالیب و نەوەکانیەتی:

یەکەم: ئەو بنەرەتە کە بڕیارە بەهەشت ودۆزەخ یەکلا بکاتەوەو ریشەی قەڵەمڕەوی هەموو کۆمەڵگەی ئیسلامیە تا رۆژی دوایی، بۆچی بە ئایەتێك راشکاوانە باسنەکراوە، ئایا ئەمە ناراستی ئەو بانگەشەیە نیە؟ یان ئەوەیە ئەبووبەکر و عومەر و عوثمان لە کۆکردنەوەی قورئاندا راستیگەلێکی ناو قورئانیان لابردووە؟ جا ئەگەر بڵێین یەکەمیان راستە، ئیتر بنەرەتی بانگەشەی ئیمامەت بە دەلیلی قورئانی لەکاردەکەوێت، ئەگەریش بڵێین دووەمیان راستە، ئەوە هیچ بنەرەتێکی دروست بۆ ئیسلام نامێنێتەوە کە لەسەری بڕۆین، چونکە ئەگەر ئەوان و هاوەڵانی تر قورئانیان ناتەواو تۆمار کردبێت، کەوابوو هەم قورئان تەواوی پەیامی خوا نیە، هەم چی فەرموودەیە لەکاردەکەوێت، هەم خوێندکارەکانی پێغەمبەر (صلی الله

علیه وسلم) دەبنە خوێندکارانێکی باش پەروەردە نەکرا و و ناپاك و هەلپەرست (دوور لەوان).

دووەم: چۆن دەکرێت عەلی کوڕی ئەبووطالیب کە موژدەپێدراوی بەهەشت و زاوای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و میراتگری دین و دنیایی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)بێت، کەچی ئامادە نەبێت لەسەر ئەو مافە خوداییە شەڕ بکات و دەرفەت بدات کەسانێکی تر رێرەوی بڕیاری خوا و ئایینی خوا بگۆڕن، لە کاتێکدا ئەو لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) چەندین جار لە غەزاکاندا چووەتە گەرمەی جەنگەوەو باکی نەبووە لە مان و نەمانی لە دنیادا.

ئەوەی لێرەدا بە کورتی قسەی لەسەر دەکەین بریتیە لە ئاماژەکانی سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ هەریەك لە ئەبووبەکر و عەلی، کۆبوونەوەی بەنی ساعیدەو بەیعەتدان بە ئەبووبەکر، ئەوانەی لە بەیعەتدان دواکەوتن، بەیعەتدانی عەلی بە ئەبووبەکر.

## چەند ئاماژەیەکی سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئەبووبەکر

جارێك جوبەیر لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو کە ئافرەتێك هات بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کرد بە ئافرەتەکە جارێکی تر بێتەوە بۆ لای، ئافرەتەکە وتی ئەی ئەگەر هاتمەوەو تۆم نەبینی؟ وەك ئەوەی بڵێت ئەگەر مردبوویت، ئەویش فەرمووی: (إن لم تجديني فأتي أبابكر)، (ئەگەر منت بەدی نەکرد وەرە بۆ لای ئەبووبەکر).

ئبن عەبباس دەڵێت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە کاتی نەخۆشیەکەیدا بە پارچە قوماشێك سەری بەستبوو، چوویە سەر مینبەر و سوپاس و ستایشی خوای کرد و دواتر فەرمووی: (إنه ليس من الناس أحد أمن علي في نفسه وماله من أبي بكر بن أبي قحافة، ولو كنت متخذا من الناس خليلا لاتخذت أبا بكر خليلا، ولكن خلة الإسلام أفضل، سدوا عني كل خوخة في هذا المسجد، غير خوخة أبي بكر).

(کەس نیە بەهۆی گیان و سامانیەوە منەتباری بم جگە لە ئەبووبەکری کوڕی قوحافە، ئەگەر من دۆستی زۆر نزیکم لەنێو خەڵکدا بگرتایە، بە دڵنیایەوە ئەبووبەکر دەبوو، بەڵام هاودەمی ئیسلام باشترە، لەم مزگەوتەدا چی خێمە هەیە بەرووەمدا دایخەن جگە لە خێمەکەی ئەبووبەکر).

عەبدوڵای کوڕی زەمعە دەڵێت کاتێك نەخۆشیەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زۆری بۆ هێنا، منیش هاودەم بە ژمارەیەك لە موسڵمانان لەلای بووم، بیلال بانگی دا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی کەسێك بنێرن نوێژ بکات بۆ خەڵکەکە، منیش چووم بینیم عومەر لەناو خەڵکەکەدایەو ئەبووبەکر لەوێ نیە، وتم ئەی عومەر نوێژ بکە بۆ خەڵکەکە، عومەریش هەستا، کە الله اکبری کرد، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەنگی بیست هەواڵی ئەبووبەکری پرسی، ئەوەبوو دوای ئەوە ئەبووبەکر نوێژی کرد بۆ موسڵمانان، دواتر عومەر پێی وتم ماڵوێران ئیبن زەمعە چیت پێکردم، بەخوا کە وتت بەرنوێژی بکە، وامزانی پێغەمبەر (صلی الله علیه

وسلم) فەرمانی ئەوەی پێکردویت، ئەگەر وا تێنەگەیشتمایە بەرنوێژیم نەدەکرد بۆ خەڵکەکە، منیش وتم بەخوا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێنەکردم، بەڵام کە ئەبووبەکرم نەبینی، ئیتر تۆم بە شیاوتر زانی.

سالیمی کوڕی عوبەید باسی ساتەکانی نەخۆشی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەکات و دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەخۆش کەوت و لەهۆش خۆی چوو، دواتر هاتەوە هۆش خۆی، فەرمووی ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟ منیش وتم بەڵێ، فەرمووی بە بیلال بڵێن با بانگ بدات، بە ئەبووبەکریش بڵێن با بەرنوێژی بۆ خەڵك بکات، هەمدی لە هۆش خۆی چوو، دواتر هاتەوە هۆش خۆی، فەرمووی ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟ منیش وتم بەڵێ، فەرمووی بە بیلال بڵێن با بانگ بدات، بە ئەبووبەکریش بڵێن با بەرنوێژی بۆ خەڵك بکات، هەمدی لەهۆش خۆی چوو، دواتر هاتەوە هۆش خۆی، عائیشە وتی باوکم کەسێکی دڵناسکەو زوو گریان دایدەگرێت، بەڵکو کەسێکی تر بنێریت بۆ بەرنوێژی، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

هەمدی فەرمووی ئایا کاتی نوێژ هاتووە؟ وتمان بەڵێ، فەرمووی بە بیلال بڵێن با بانگ بدات، بە ئەبووبەکریش بڵێن با بەرنوێژی بۆ خەڵك بکات، هەمدی عائیشە وتی باوکم کەسێکی دڵناسکەو زوو گریان دایدەگرێت، بەڵکو کەسێکی تر بنێریت بۆ بەرنوێژی، پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) فەرمووی (ئێوەی ئافرەتان هاودەمە ژنەکانی یووسفن، بە بیلال بڵێن با بانگ بدات و بە ئەبوبەکریش بڵێن با بەرنوێژی بکات بۆ خەڵك)، هەمدی لەخۆش خۆی چوو، بیلال بانگی دا و قامەتی کرد و ئەبووبەکریش چوو بەرنوێژی بکات بۆ خەڵکەکە، پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) هاتەوە هۆش خۆی و فەرمووی ئایا نوێژ دابەسراوە؟ وتم بەڵێ، فەرمووی (کەسێکم بۆ بانگ بکەن تا خۆمی پێوە بگرم)، ئەوەبوو بەریرەو کەسێکی تر هاتن و پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) باڵی دایە سەر شانیان و بەو حاڵەوە چوو بۆ نوێژ، لەپاڵ ئەبووبەکردا دانیشێنرا، ئەبووبەکر ویستی بگەڕێتە دواوە، پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) ئەبووبەکری هێشتەوە تا نوێژەکە تەواو بوو.

## چەند ئاماژەیەکی تایبەت بە عەلی کوڕی ئەبووطالیب:

بەرائی کوڕی عازب بەسەرهاتێکی بەشداربوونی لە حەجی ماڵئاوایی دەگێڕێتەوەو دەڵێت لەو حەجەدا بووین کە تیایدا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) حەجی کرد، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە نێوەندی رێدا دابەزی و فەرمانی کرد بە نوێژ، دەستی عەلی گرت و فەرمووی ئایا من بۆ باوەڕداران لە خودی خۆیان لەپێشتر نیم؟ وتیان با، فەرمووی ئایا بۆ هەر باوەڕدارێك من لە نەفسی خۆی لەپێشتر نیم؟ وتیان با، فەرمووی (فهذا ولي من أنا مولاه ، اللهم وال من والاه ، اللهم عاد من عاداه).دەی ئەمە وەلی هەر کەسە کە من مەولای بم، خوایە لەگەڵ ئەوەبە کە لەگەڵیەتی و دژی ئەوە بە کە دژیەتی).

ئیبن عەبباس دەڵێت کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەخۆش کەوت و ئازارەکەی زیادی کرد، فەرمووی (پەڕەیەکم بۆ بهێنن تا نووسراوێکتان بۆ بنووسم تا دوای ئەوە گومڕا نەبن)، عومەری کوڕی خەططاب وتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئازار زۆری بۆ

هێناوە، هاوکات کتێبی خوا لەنێوماندایە بەسمانە، ئیتر قسەو مشتومڕ لەنێو هاوەڵاندا زۆر بوو تا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی (قوموا عني ولا ينبغي عندي التنازع)، (لەلام هەستن و بڕۆن و شیاو نیە لە لای مندا ناکۆکی هەبێت)، ئیبن عەبباس کە ئەم فەرموودەی دەگێڕایەوە دەیوت ڕۆژی پێنج شەممە بوو، ئینجا دەستی کرد بە گریان و زۆر گریا.

جا شیعەو هەوادارانیان پێیان وابووە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ویستوویەتی ئەو نووسراوە بنووسێت بۆ عەلی کوڕی ئەبووطالیب، بەڵام عومەری کوڕی خەططاب ئەوەی زانیوە، بۆیە ڕێی لێگرتووە.

کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەخۆش کەوت،خەڵکی بە عەلی کوڕی ئەبووطالیبیان وت ئەرێ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) حاڵی چۆنە؟ وتی سوپاس بۆ خوا باشەو چاك دەبێتەوە، عەبباس دەستی عەلی گرت و وتی مەگەر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نابینیت؟ بەخوا من تەواو وای دەبینم پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەم نەخۆشیەیدا کۆچی دوایی دەکات، با بچین بۆ لای

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و پرسیاری لێ بکەین تا بزانین کارو بەرپرسیاریەتی دواتر بۆ کێ دەبێت، ئەگەر بۆ ئێمەیە با بیزانین، ئەگەریش بۆ ئێمە نیە پێی دەڵێین و وەسیەتمان بۆ دەکات، عەلی وتی بەخوا ئەگەر پرسیار لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکەین لەوبارەوە-داوای بکەین-و رازی نەبێت پێمان ببەخشێت، ئەوە ئیتر هەرگیز خەڵکی پێمان نابەخشێت، منیش هەرگیز ئەو پرسیارە لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ناکەم.

## بەیعەتدانی عەلی بە ئەبووبەکر:

لەم بارەیەوە دوو گێڕانەوەی سەرەکی هاتون کە بریتین لە:

گێڕانەوەی یەکەم:

کاتێك خەلیفەی باوەڕداران لە رۆژی دووەمدا بەیعەتی لە موسڵمانان وەردەگرت، هەریەك لە عەلی کوڕی ئەبووطالیب و زوبەیری کوڕی عەووام لەوێ نەبوون، بۆیە ئەبووبەکر داوای عەلی کرد، برێك لە پشتیوانان چوون عەلییان هێنا، ئەبووبەکر وتی ئامۆزا و زاوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەتەوێت ریزی موسڵمانان دووکەرت بکەیت؟ عەلی وتی کێشەم نیە ئەی خەلیفەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەوەبوو بەیعەتی پێدا، ئینجا تەماشای کرد زوبەیر دیار نیە، بۆیە ناردی بە شوێنیدا و زوبەیر هات، زوبەیر وتی پورزا و حەواری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەتەوێت ریزی موسڵمانان دووکەرت بکەیت؟ ئەویش هەمان شتی عەلی کوڕی ئەبوو تالیب وتەوەو بەیعەتی پێدا.

گێڕانەوەی دووەم:

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: دوای وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم)، فاطیمە داوای لە ئەبووبەکر کرد تا لە بەجێماوی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) میراتی پێ بدات، ئەبووبەکر پێیوت پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) فەرموویەتی(چی بە میرات جێبهێڵین صەدەقەیە)، فاطیمە بەوە تووڕە بوو و دەنگی لە ئەبووبەکر وەرگرت و تا مرد ئەبووبەکری نەدواند، کە فاطیمە وەفاتی کرد عەلی بە شەو ئەسپەردەی کرد و ئەبووبەکری بانگ نەکرد، دوای مردنی فاطیمە دەموچاوی خەڵکی شیرین نەدەبینی، بۆیە بڕیاری دا لەگەڵ ئەبووبەکر ڕێکبکەوێت و بەیعەتی پێبدات، ئەو ماوەیەش-شەش مانگە- هێشتا بەیعەتی نەدابوو، بۆیە هەواڵی نارد بۆ ئەبووبەکر و وتی وەرە بۆ لامان و با کەس نەیەت لەگەڵتدا، چونکە حەزی نەدەکرد عومەر ئامادەی کۆڕەکە بێت، عومەر کە ئەوەی زانی وتی نا بەخوا بە تەنها ناچیت بۆ لایان، ئەبووبەکر وتی بۆ پێت وایە چیم پێ دەکەن؟ بەخوا دەچم بۆ لایان، ئەبووبەکر چوو بۆ لایان، عەلی قسەی کرد و

وتی ئێمە فەزڵی تۆ دەزانین و ئاگادارین خوا چی پێ بەخشیویت، حەسودیش نابەین بەو خێرەی خوا پێیداویت، بەڵام تۆ تاکڕەوانە بێ ئێمە بڕیارت دا، ئێمە پێمان وابوو بە نزیکیمان لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پشکێکمان دەبێت، کە ئەبووبەکر ئەم قسانەی بیست چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك، ئینجا ئەبووبەکر قسەی کرد و وتی سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە، خزمایەتی و نزیکی پێغەمبەری خوام (صلی الله علیه وسلم) لا ئازیزترە لە پەیوەندی خزمایەتی خۆم، بەڵام ئەوەی لە نێوان من و ئێوەدا سەبارەت بەو سامانە هەبووە، لەبەر چاکە بووەو بینیبێتم پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چی کردبێت منیش وامکردووە، عەلی بە ئەبووبەکری وت سبەی ئێوارە وادەی بەیعەت دەبێت، ئەوەبوو کە ئەبووبەکر نوێژی نیوەڕۆی کرد، چوویە سەر مینبەر و شایەتومانی وتەوەو باسی عەلی و شکۆی کرد و باسی ئەوەشی کرد کە بەیعەتی نەداوە و بیانووی عەلی بۆ ئەوە چی بووە، دواتر داوای لێخۆشبوونی لە خوا کرد، ئینجا عەلی شایەتومانی وتەوەو باسی گەورەیی مافی ئەبووبەکری کرد و وتی ئەوەی

کردوویەتی لەبەر حەسوودی بردن بە ئەبووبەکر و لەبەرچاو نەگرتنی فەزڵی نەبووە، بەڵکو پێی وابووە پشکی هەبووە لەو بوارەدا و ئەبووبەکر تاکڕەوانە بۆ خۆی بردووە، بەوە دڵمان نارەحەت بوو، موسڵمانان بەمە دڵخۆش بوون و وتیان راستت پێکا.

ئیبن حەجەر دەڵێت: سەبارەت بە داواکاری ئامادەنەبوونی عومەر لەبەرئەوە بوو کە دەیانناسی عومەر لە گوفتار و کرداریشدا رەق و توندە، بەڵام ئەبووبەکر کەسێکی نەرم بوو، سەبارەت بەوەش کە دەڵێت ئەو ماوەیە بەیعەتی پێ نەداوە، لەوانەیە مەبەستی ئامادە نەبوونی بووبێت لە کۆڕ و کۆبوونەوەیدا.

نەوەوی لە شەرحی فەرموودەکەدا دەڵێت: مەبەست بەوەی دەڵێت (فاتیمە تا مرد نەیدواند) ئەوەیە کە یان لەو بارەوە حسابی میرات- نەیدواندووە، یان ئەوەیە خۆی لێ دوورگرتووە، نەك ئەوەی بە یەك بگەن و سەلام لە ئەبووبەکر نەکات و قسەی لەگەڵ نەکات، سەبارەت بە بەیعەت نەدانەکەی عەلیش ئەوە زانایان کۆکن لەسەرئەوەی مەرج نیە بۆ دروستی بەیعەت هەموو خەڵك و هەموو ئەهلی حەل و

عەقدیش بەیعەت بدەن، بەڵکو مەرجەکە ئەوەیە چەندە لە کۆی زانا و سەرکردەو پیاوماقوڵانی ناو خەڵك بگونجێت بەیعەت بدەن، هەروەها مەرج نیە هەر کەس دەست بخاتە دەستی و بەیعەت بدات، کەسێك ملکەچ بێت و دژایەتی نیشان نەدات بەسە، عەلیش لەو ماوەیەدا ئاوا بووە، بەڵکو نەیاری نەنواندووەو ریزی کەرت نەکردووە، بەڵکو گلەییەك لە دڵیدا ماوەتەوەو وەستاوە تا ئەوە نەماوە، جا ئەم فەرموودەیە روونکردنەوەی دروستی خیلافەتی ئەبووبەکرە.

بەیهەقی دەڵێت: ئەو گێڕانەوەی کە دەڵێت عەلی تا دوای مردنی فاطیمە بەیعەتی نەداوە-گێڕانەوەی دووەم- مونقەطیعە، فەرموودەکەی ئەبووسەعیدی خودری کە دەڵێت پاش ثهقیفە لە بەیعەتی گشتیدا عەلی بەیعەتی داوە بە ئەبووبەکر راستترە.

ئیبن کەثیر سەبارەت بەوەی کام لەم دوو گێڕانەوەیە راستە دەڵێت: بەیعەتی پاش مەرگی فاطیمە بەیعەتی دووپات کردنەوە بوو و دووەم بەیعەت بوو، بەڵکو لەو ماوەدا عەلی لە دوای ئەبووبەکرەوە نوێژی دەکرد و بۆ راوێژ لای ئەبوبەکر بوو و لەگەڵیشیدا چوو بۆ ذیلقیصە.

## ئایا عەلی حەزی بە خیلافەت هەبووە؟

سەبارەت بەوەی ئایا عەلی حەزی بە خیلافەت هەبووە یان نا، ئەوا دەتوانین بە چەند بەڵگەیەك بیسەلمێنین كە بەڵێ، بەڵام سەبارەت بەوەی ئایا خیلافەتی بۆ واجب بووە یان نا، ئەوە هیچ بەڵگەیەكی صەحیح نیە بۆ واجب بوونی خیلافەت یان ئەوەی شیعە پێی دەڵێت ئیمامەت بۆ عەلی:

كاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەخۆش كەوت، خەڵكی بە عەلی كوڕی ئەبووطالیبیان وت ئەرێ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) حاڵی چۆنە؟ وتی سوپاس بۆ خوا باشەو چاك دەبێتەوە، عەبباس دەستی عەلی گرت و وتی مەگەر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نابینیت؟ بەخوا من تەواو وای دەبینم پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەم نەخۆشیەیدا كۆچی دوایی دەكات، با بچین بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و پرسیاری لێ بكەین تا بزانین كارو بەرپرسیاریەتی دواتر بۆ كێ دەبێت، ئەگەر بۆ ئێمەیە با بیزانین، ئەگەریش بۆ ئێمە نیە پێی دەڵێین و وەسیەتمان بۆ دەكات، عەلی وتی

بەخوا ئەگەر پرسیار لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بکەین لەوبارەوە-داوای بکەین-و رازی نەبێت پێمان ببەخشێت، ئەوە ئیتر هەرگیز خەڵکی پێمان نابەخشێت، منیش هەرگیز ئەو پرسیارە لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناکەم.

لە گێڕانەوەکەی بوخاریدا سەبارەت بە بەیعەتدانی عەلی بە ئەبووبەکر، کاتێك عەلی قسەی کرد وتی ئێمە فەزڵی تۆ دەزانین و ئاگادرین خوا چی پێ بەخشیویت، حەسودیش نابەین بەو خێرەی خوا پێیداویت، بەڵام تۆ تاکڕەوانە بێ ئێمە بڕیارت دا، ئێمە پێمان وابوو بە نزیکیمان لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پشکێکمان دەبێت، ئەمەش ئاماژەیە بەوەی نیازی هەبووە پشکی هەبێت.

حەسەنی کوڕی عەلی پێش مردنی حوسەینی برای بانگ کرد و ئەم وەسیەتەی بۆ کرد: (براکەم باوکمان-عەلی- بەر رەحمەتی خوا بکەوێت کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کرد خۆی بۆ ئەم بارە-دەسەڵات- دانابوو و هیوای وابوو بۆ ئەو بێت، ئەوەبوو خوا دووری

گرت لێی و دایە دەست ئەبووبەکر، کە ئەبووبەکر سەرەمەرگی هات هەمدی حەزی پێکرد، ئەوەبوو هەمدی دوورخرایەوە لێی و بەر عومەر کەوت، کە عومەر سەرەمەرگی هات کردی بە شوورا لە نێوان شەش کەسدا کە باوکیان یەکێك بوو لەوان، ئەوەبوو بەر عوثمان کەوت، کە عوثمانیش کوژرا بەیعەتی پێدرا، دوایی ململانێی لەگەڵ کرا تا شمشێری بۆ هەڵکرد و لەسەری جەنگا، بارەکە بۆی لەبار نەبوو و هیچی لێ دەست نەکەوت، سوێند بەخوا وانابینم خوای گەورە پێغەمبەرایەتی و خیلافەتیش لە ناو ئێمەی ئالوبەیتدا کۆبکاتەوە.

## سەعدی کوڕی عوبادەو خیلافەتی ئەبووبەکری صدیق

برێك گێرانەوە هاتون سەبارەت بەوەی سەعدی کوڕی عوبادە ئامادە نەبوە بەیعەت بدات بە ئەبووبەکر و هەوڵی داوە پشکی پشتیوانان سەربخات و تا دواساتی ژیانی بەیعەتی نەداوە، ئەمە لە راستیەوە دوورەو تەنها بۆ شێواندنی مێژووی ئیسلامیە، ئەگەرنا چ رابردووی سەعد و چ دەقە صەحیحەکان ئەوە دەسەلمێنن مەسەلەکە وا نەبووە، بەڵام وەك سپاردەیەکی زانستی هەموو دەقەکان دەهێنین:

کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەفاتی کرد و پشتیوانان لە کەپری بەنی ساعیدە کۆبوونەوە، لە دەوری سەعدی کوڕی عوبادە کۆبوونەوەو دەیانوت ئەمیرێك لە ئێمەو ئەمیرێك لە پشتیوانان، ئەوان دەیانویست بەیعەت بە سەعدی کوڕی عوبادە بدەن.

سەعد لەو کاتەدا نەخۆش بوو و تایەکی زۆری هەبوو، خۆی گرمۆڵە کردبوو.

بە پێی گێڕانەوەیەکی لاواز-ذەهەبی دەڵێت سەنەدەکەی بەو جۆرەیە کە دەیبینیت - هاتووە کاتێك بەیعەت درا بە ئەبووبەکری صدیق،

ئەبوبەکر ناردی بە شوێن سەعددا و پێی وت وەرە بەیعەت بدە وا خەڵکەکە بەیعەتیان داوە، بەڵام سەعد وتی بەخوا بەیعەتتان پێ نادەم تا هاودەم بەوانەی لەگەڵ منن لەگەڵتان دەجەنگم، بەشیری کوڕی سەعد لەوێ بوو وتی ئەی خەلیفەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەو یاخی بووە و تا نەکوژرێت بەیعەتتان پێ نادات، تا منداڵ و عەشرەتەکەشی لەگەڵی نەکوژرێن ناکوژرێت، بۆیە تا دەتوانن مەیبزوێنن، ئەو خۆی تەنهایە، ئەبووبەکریش وازی لێهێنا، دواتر کە عومەر بوو بە خەلیفە پێی گەیشت و وتی ئێ سەعد، ئەویش وتی ئێ عومەر، عومەر لێی پرسی بەیعەتی پێ دەدات، کەچی وتی هاوەڵەکەت لە تۆ لامان خۆشەویستتر بوو، بەخوا حەزم بە دراوسێیەتیت نیە، عومەر وتی هەرکەس رقی بێت لە دراوسێکەی جێی دێڵێت، ئەوەبوو سەعد چوو بۆ شام و پاش ماوەیەك لەوێ مرد.

بەڵام بەپێی گێڕانەوەی صەحیح هاتووە کە کاتێك پشتیوانان داوای خیلافەتیان کرد و ئەبووبەکر دواتر وتاری پێشکەش کرد، تیایدا وتی ئەی سەعد تۆ خۆت لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

دانیشتبوویت کە فەرمووی (قريش ولاة هذا الامر، فبر الناس تبع لبرهم و فاجرهم تبع لفاجرهم)، (قورەیشیەکان هەڵگری ئەم پرسەن، خەڵکی چاکەکاریان شوێنکەوتەی چاکەکاریانن و خراپەکاریشیان شوێنکەوتەی خراپەکاریانن)، سەعد پێی وت راست دەکەیت، دەی ئێمە وەزیر و ئێوەش ئەمیرن.

پاشان، ئەگەر سەعد ئامادە نەبوو بێت بەیعەت بدات لەکاتێکدا گەورە و قسەرۆیشتووی ناو پشتیوانان بووەو هەموان رازی بون بە بڕیارەکانی، چۆن لە هەموو ماوەی خیلافەتی ئەبووبەکر و عومەردا کێشە و گرفتێکی نەنایەوە، چۆن لەکاتی ئەو هەموو بارگرژیەی سەردەمی خەلیفە ئەبووبەکردا دەستی خۆی نەوەشاند و هەوڵی جوداخوازی نەدا، بۆیە ئەمانە تەنها خەونی کەسانێك بووە کە حەزیان کردووە ئاقاری رووداوی کەپری بەنی ساعیدە وای لێ بێت و دواتر ئەو خەونەیان داڕشتووەو لە سەرچاوەکاندا دایانناوەتەوە، ئەگەرنا لە روانگەی مێژوویەوە هیچ پاڵپشتیەکی واقیعی دەست ناکەوێت.

## ماوەی خیلافەتی ئەبووبەکر

کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەفاتی کرد و بەیعەت درا بە ئەبووبەکری صدیق، ئەبووبەکر لە ماڵی حەبیبەی ژنی بوو کە لە ناوچەی سونح بوو و دوور بوو لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەوەبوو ماوەی شەش مانگ لە خیلافەتی ڕۆژانە بە پێ یان هەندێ جار بە سوارێك دەچوو بۆ ناو مەدینە بۆ لای مزگەوت و دواتر دەگەڕایەوە بۆ ماڵی ئوممو حەبیبە.

## پرسی ئالوبەیت

پاش وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و بەیعەتدان بە ئەبووبەکری صدیق، فاتیمەی کچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و عەبباسی مامی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) چوون بۆ لای ئەبووبەکرو داوای میراتییان کرد، ئەبووبەکریش پێی ڕاگەیاندن کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی دوای خۆی میراتی جێناهێڵێت و هەرچی جێهێشت ئەوە صەدەقەیە.

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: دوای وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، فاطیمە داوای کرد لە ئەبووبەکر تا لە بەجێهاوی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) میراتی پێ بدات، ئەبووبەکر پێی وت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی(چی بە میرات جێبهێڵین صەدەقەیە)، فاطیمە بەوە تووڕە بوو و دەنگی لە ئەبووبەکر وەرگرت و تا مرد هەروا بوو.

چەند شەوێکی کەم بەسەر وەفاتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) تێپەڕ بووبوو، ئەبووبەکری صدیق نوێژی عەسری کرد بۆ موسڵمانان، کە لێبوونەوە هاتەدەرەوەو عەلیش لەگەڵیدا بوو دەڕۆیشتن بە ڕێدا، ئەبووبەکر حەسەنی بینی کە لەگەڵ چەند منداڵێك یاری دەکرد، ئەبووبەکر حەسەنی گرتە قەلادۆشکان و دەیوت لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەچێت نەك لە عەلی، عەلیش پێدەکەنی.

عەلی کوڕی ئەبووطالیب بەیعەتی دا بە ئەبووبەکری صدیق، زۆریش لێی ڕازی بوو، عەلی دەیوت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەبووبەکری پێشخست بۆ بەرنوێژی لەکاتێکدا من ئامادەو لەشساغیش بووم، ئەگەر بیویستایە منی پێشدەخست، بۆیە ئەو کەسەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ دینەکەمان پێی ڕازی بوو، ئێمەش بۆ دنیاکەمان پێی ڕازی بووین، هەروەها دەیوت چاکترینی ئەم ئوممەتە دوای پێغەمبەرەکەی ئەبووبەکرو عومەرن.

فەرموودەیەك بە صەحیحی هاتووە کە مشتومڕێك لەسەر ڕوانینی عەلی بۆ میراتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەخاتەڕوو، ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە:

مالیکی کوڕی ئەوس دەڵێت عومەری کوڕی خەططاب ناردی بە شوێن مندا، منیش چووم بۆ لای و ئەوکات خۆر لە بەرزایی ئاسمان بوو، دەبینم لە ماڵەوە دانیشتووەو لەسەر پشتیەکی پێستە پاڵی داوەتەوە، پێی وتم ئەی مال-ناوەکەی کورت کردوەتەوە- خەڵکێ لە هۆزەکەت هاتن و منیش بەخششێکی کەمم کردن، بڕۆ لە نێوانیاندا دابەشی بکە، منیش وتم بریا کەسێکی ترت لەبری من ڕاسپاردایە، ئەویش وتی مالیك لێنەوە، ئینجا یەرفە ْ–پەردەدارەکەی عومەر- هات و وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران مۆڵەت دەدەیت عوثمان و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و زوبەیر و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بێنە ژوورەوە؟ عومەر وتی بەڵێ، ئەویش مۆڵەتی پێدان و هاتنە ژوورەوە، ئینجا یەرفە هاتەوەو وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران مۆڵەتی عەبباس و عەلی دەدەیت بێنە ژوورەوە؟ وتی بەڵێ، مۆڵەتی دا و

ئەوانیش هاتنە ژوورەوە، عەبباس وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران لەنێوان من و ئەم درۆزنە تاوانبارە ناپاکە خیانەتکارەدا دادوەری بکە-مەبەستی عەلی بوو-، ئەوانەی لەوێ ئامادە بوون وتیان بەڵێ ئەی ئەمیری باوەڕداران دادوەری نێوانیان بکەو رەحم بەرامبەریان بنوێنە، -مالیك دەڵێت وام هاتە پێش چاو ئەو چوارەش بۆ هەمان شت هاتبوون بۆ لای عومەر-، عومەر وتی لەسەرخۆ بن، دواتر روویکردەوە ئەو دەستەیە و وتی سوێندتان دەدەم بە خوا کە ئاسمان و زەوی بە مۆڵەتی ئەو وەستاون، ئایا دەزانن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(میراتی جێناهێڵین، هەرچیمان جێهێشت صەدەقەیە)؟ وتیان بەڵێ، ئینجا تەماشای عەلی و عەبباسی کرد و وتی سوێندتان دەدەم بە خوا کە ئاسمان و زەوی بە مۆڵەتی ئەو وەستاون، ئایا دەزانن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (میراتی جێناهێڵین، هەرچیمان جێهێشت صەدەقەیە)؟ وتیان بەڵێ، عومەر وتی دەی خوا تایبەتمەندیەکی بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەخشیوە کە بە هیچ کەسی تری نەبەخشیوە، خوا دەفەرموێت (وَمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى

رَسُولِهِ مِنْهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَكِنَّ اللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُ عَلَى مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)، لەوەش ئەوەی بەنو نەضیر بوو، دەی بەخوا تایبەتی نەکرد بە خۆی و بێبەشی نەکردن، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خەرجی ساڵێك یان خەرجی ساڵێکی خۆی و خێزانەکانی لێ هەڵدەگرت و ئەوەی دەمایەوە لە رێی خوادا دەیبەخشی، ئینجا عومەر روویکردە ئەو چوارەی تر و وتی سوێندتان دەدەم بە خوا کە ئاسمان و زەوی بە مۆڵەتی ئەو وەستاون، ئایا ئەوە دەزانن؟ وتیان بەڵێ، ئینجا لایکرد بە لای عەلی و عەبباسدا و وتی سوێندتان دەدەم بە خوا کە ئاسمان و زەوی بە مۆڵەتی ئەو وەستاون، ئایا ئەم دوانەشتان ئەمە دەزانن؟ وتیان بەڵێ، عومەر وتی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کرد ئەبووبەکر وتی من دۆست و وەلی پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم)، تۆ-عەبباسی دەدواند- و ئەمە-واتە عەلی- چوون بۆ لای ئەبووبەکر، تۆ میراتی برازاکەتت داوا دەکرد-واتە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)- ئەمیش میراتی ژنەکەی-واتە فاطیمە- لە باوکیەوە –واتە پێغەمبەر (صلى الله

علیه وسلم)- داوا دەکرد، ئەبووبەکر وتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی(میراتی جێناهێڵین، ئەوەی جێی دەهێڵین صەدەقەیە)، کەچی ئەم دوانەتان واتاندەزانی درۆ دەکات و تاوانبار و ناپاکە، خواش دەزانێت راستگۆ و چاکەکار و ژیر و تێگەیشتوو بوو و شوێن حەق کەوتبوو، ئەوەبوو دەسەڵاتی گرتەدەست، دواتر کە ئەبووبەکر وەفاتی کرد من وتم من دۆست و وەلی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و دۆست و وەلی ئەبووبەکرم، کەچی ئەم دوانەتان واتاندەزانی من درۆ دەکەم و تاوانبار و ناپاك و خیانەتکارم، خواش زانایە کە من راستگۆ و چاکەکار و ژیر و تێگەیشتوو و شوێنکەوتەی حەقم، ئەوەبوو دەسەڵاتم گرتەدەست، ئینجا ئێستا تۆ و ئەمە و هەموو ئێوەش هاتون و قسەتان یەکەو لەو بارەوە پرسیار لە من دەکەن-واتە باری دەسەڵات-، منیش دەڵێم ئەگەر ئەم دوانەتان دەتانەوێت ئەوە بدەمە ئێوەو بەرامبەر بەوە بەڵێنی خواتان لەسەر بێت کە بەو جۆرەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەسەری بوو لەسەری بڕۆن، لەسەر ئەوە لە منی وەربگرن و دواتر بێن بۆ لام و داوا بکەن بە بارێکی تر-

جیا لەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەری دەرۆیشت-دادوەری نێوانتان بکەم؟! نا بەخوا تا رۆژی دوایی جگە لەوە-کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەری دەچوو- دادوەری نێوانتان ناکەم، ئەگەریش دەرەقەتی ئەوە نایەن ئەوە بیدەنەوە دەست خۆم.

لەم فەرموودەدا بۆمان دەردەکەوێت لەلایەکەوە هەموو ئەو هاوەڵانە دانیان بەوەدا ناوە کە بیستوویانە لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) میراتێ جێناهێڵێت و لەوەدا ئەبووبەکر لەسەر حەق بوو کە میراتی نەبەخشی بە فاطیمە، هەروەها بەڵگەیە لەسەر بوونی کێشەی نێوان هاوەڵان و هەوڵدانیان بۆ چارەسەرکردنی، هەروەها عومەر لە هەڵوێستی عەلی و عەبباسەوە روانینی خۆی بۆ ئەو هەڵوێستەیان نیشانداوە کە لەوانەیە ئەوان ئەویش و ئەبووبەکریش بە درۆزن و ناپاك تەماشا بکەن، لەکاتێکدا بەپێی گێڕانەوەی تر کە باسمان کردووە ئەو گومانە نەبووە، بەڵام ئەم دەربڕینە هاوشێوەی ئەوەیە کەسێك کە بەرامبەرەکەی دەدوێنێت بۆ زیاتر سەلماندنی حەقبوونی دەڵێت هەرچەندە تۆ وادەزانیت من ئاواو ئاوەهام، لەلایەکەوە تا ئەگەر ناخی

بەرامبەر شتێکی تێدا بێت ڕێی بۆ بکاتەوە تا ئاشکرای بکات، لەلایەکی تریشەوە تا پێی بڵێت من ڕام وایە تۆ وا بیر دەکەیتەوە.

کاتێ ئەبووبەکر وەفاتی کرد بە بەرگێ دایانپۆشی و گریان مەدینەی گرتەوەو خەڵکی شڵەژان چەشنی ئەو ڕۆژەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کۆچی دوایی کرد، عەلی کوڕی ئەبووطالیب خێرا بە گریانەوە گەڕایەوەو دەیفەرموو (ئەمڕۆ خیلافەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دابڕا)، ئینجا هات تا گەیشتە بەردەرگای ئەو ماڵەی ئەبووبەکری تێدا بوو، وەستا و وتی: (بەر ڕەحمەتی خوا کەویت ئەی ئەبووبەکر، تۆ یەکەم کەس بوویت موسڵمان بوویت، لەهەمووان پوختتر و دڵسۆزانەتر باوەڕت هێنا، دڵنیایی و بێگومانیت لە هەموان زیاتر بوو، لە هەموان لەخواترس تر و دەوڵەمەندتر بوویت و لە هەموان زیاتر لە دەوری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوویت...

پلەوپایەت لە هەموویان بەرزتر بوو، پێشرەوی هەموویان بوویت، پلەت لەهەموویان بەرزتر بوو، لە هەموویان زیاتر لە پێغەمبەری خواوە نزیك بوویت، لەڕووی ڕەوشت و هەڵوێستەوە لە هەموان زیاتر

لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەچوویت، لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە هەموویان جێ متمانەتر و پایەبەرزتر بوویت و بەڕێزتریان بوویت لە خزمەتیدا، دەی خوای گەورە لەسەر ئیسلام و پێغەمبەرەکەی و موسڵمانان پاداشتی خێرت بداتەوە، کاتێ خەڵکی پێغەمبەری خوایان بە درۆزن دەزانی تۆ بەراستت دەزانی، بۆیە خوای گەورە لە کتێبەکەی خۆیدا بە صدیق ناوی هێنایت (و الذي جاء بالصدق)، کاتێ خەڵکی بەرامبەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پیسکە بوون، تۆ شوێنکەوتە و دڵنەواکەری بوویت، کاتێ خەڵکی دانیشتن و لەگەڵی نەچوون تۆ لەگەڵیدا راوەستایت، لەکاتی سەختیدا بە جوانترین شێوە هاوەڵی ئەوت کرد، سوکناییت بۆ دەهێنا و هاوڕێیی کۆچ و باروحاڵی نارەحەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوویت، دوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەجوانترین شێوە خیلافەتت کرد بۆ ئوممەتەکەی، کاتێ خەڵکی لە ئیسلام هەڵگەرانەوە بەجۆرێك ئایینی خوات بەجێگەیاند کە خەلیفەی هیچ پێغەمبەرێکی پێشتر وا بەجێی نەگەیاندووە، کاتی لاوازی هاوەڵانت بەهێز بوویت، کاتی

ترسی ئەوان سەرپێ ڕاوەستایت، وێڕای پێ ناخۆشبوونی دووروان و بێزاری و توورەیی بێباوەڕان دەستت گرتبوو بە ڕێباز و بەرنامەی پێغەمبەری خواوە، کاتێ دەوروبەرت شکستیان خوارد بە رووناکی خوا خیلافەتت گرتەدەست، لەسەروو هەموویانەوە بویت و لەهەموشیان کەمتر قسەت دەکرد و لە هەموان زیاتر ڕاستیت دەپێکا و لە هەموان زیاتر بێدەنگ دەبوویت، ڕەوانبێژی و بڕیاردروستی و دلێری و دڵنیایی و کرداری چاك و شارەزاییت بە کارەکان لە هەموان زیاتر بوو، بۆ ئیسلام سەرگەورەیەك بوویت و بۆ باوەڕدارانیش باوکێکی میهرەبان، کاتێ بە خاوخێزانەوە دەهاتنە لات باری قورسی لاوازی ئەوانت دەگرتە ئەستۆ، چییان لەدەست دەدا تۆ دەتپاراست، چییان پشتگوێ بخستایە تۆ ئاگاداری دەبوویت، کاتی کەمصەبری ئەوان خۆڕاگر بوویت، ئەوەی ئەوان هەوڵیان بۆ دەدا تۆ پێی گەیشتیت، بەهۆی تۆوە گەیشتن بەوەی کە چاوەڕێ نەبوون دەستیان بکەوێ، بۆ بێباوەڕان سزایەك بوویت و دەرژایت بەسەریاندا، بۆ باوەردارانیش بارانی ڕەحمەت و بەرەکەت بوویت، بارانی

دەوڵەمەندی و سوکنایی و پارێزگاری بوویت... وەك شاخێ وابوویت کە رەشەبا نایجوولێنێت و شکێنەرەکان لەناوی نابەن... کەسی لاواز و زەلیل لای تۆ بەهێز بوو تا مافت بۆ وەردەگرتەوە، کەسی بەهێز و بە دەسە{تیش لای تۆ زەلیل و لاواز بوو تا کاتێ مافت لێ وەردەگرتەوە، لەوەشدا دوور و نزیك لای تۆ وەك یەك بوون... بەخوا پێشڕەیو زۆرت کردو ئەوەی دوای تۆ دێت چاك ماندووی دەکەیت ... رازین بە قەزای خودا و ملکەچی کارو فەرمانی دەبین، دوای وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) موسڵمانان بە هیچ شتێ هێندەی مەرگی تۆ موصیبەتبار نابن...

خوای گەورە بتگەیەنێتەوە بە پێغەمبەرەکەت و ئێمەش لە پاداشتت بێ بەش نەکات و دوای تۆ گومڕامان نەکات) خەڵکی بێدەنگ بووبوون تا وتەکانی تەواو بوون، دواتر هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گریان و وتیان راستت فەرموو ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم).

# سوپاکەی ئوسامەی کوڕی زەید

لە کاتی نەخۆشی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، ڕۆژی چوارشەممە بوو کە تاو نارەحەتی پێغەمبەری خوای(صلی الله علیه وسلم) داگرت، بەڵام ڕۆژی پێنج شەممە خۆی چوو ئاڵآکەی دایە دەست ئوسامەی کوڕی زەید، لەنێو سوپاکەیدا ئەبووبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەطاب و ئەبوو عوبەیدەی کوڕی جەراح و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و چەندین هاوەڵی تری گەورە هەبوون، لەسەر ئەوە کەسانێ نارەزاییان دەربڕی، بۆیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تەواو توورەبوو و لەتاو ئازاریش سەری بەستبوو، چوویە سەر مینبەر و سوپاس و ستایشی خوای کرد و دواتر فەرمووی(پاشان ئەی خەڵکینە ئەو قسەو باسە چیە پێم گەیشتوەتەوە لە هەندێکتان سەبارەت بەوەی ئوسامەم بە ئەمیر داناوە، ئەگەر تانە دەدەن لە ئەمیرایەتی ئوسامە پێشتریش تانەتان دا لەوەی باوکیم بە ئەمیر دانا،

ئەرێ بەخوا ئەو کەسە بۆ ئەمیرایەتی دروست کرابووو دوای خۆیشی کوڕەکەشی بۆ ئەمیرایەتی دروست کراوە...)

بەڵام ئوسامە خێرا نەچوو چونکە هەواڵی نەخۆشی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) بیست، ئەوەبوو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە کۆچی دوایی کرد، ئوسامە لە ناوچەی (ذي خشب) بوو، دواتر لەسەردەمی ئەبووبەکری صدیقدا ئەو سوپایە بە سەرکردایەتی ئوسامە بەڕێکەوت، هەرچەندە داوا کرا تا خەلیفە جارێ ئەو سوپایە نەنێرێ بەڵام ئەو رازی نەبوو سوپایەك بوەستێنێ کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ڕێکیخستبوو بۆ چوون، ئامادەش نەبوو ئەو سەرکردەیەی لا ببات کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دایینابوو، تەنها داوای لە ئوسامە کرد ڕێ بدات عومەر نەچێت تا یارمەتی بدات چونکە ئەوکات زۆرێك لە عەرەبەکان لە ئیسلام هەڵگەرابوونەوە، ئوسامەش ڕێی پێدا، ئوسامە چوو و هێرشی برد و سەرکەوتنی بەدەستهێنا.

لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سوپاکەی ئوسامەی ڕێکخست و ئوسامەی

کوڕی زەیدی کردە سەرکردەی سوپاکە، تیایدا بورەیدە ئالآکەی بەدەستەوە بوو، دواتر کە زانرا بە نەخۆشیەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بورەیدە ئالآکەی ئوسامەی کوڕی زەیدی هێنا و لەبەردەم ماڵی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) دایکوتا، دواتر کە بەیعەت درا بە ئەبووبەکری صدیق خەلیفە فەرمانی کرد بە بورەیدەی کوڕی حوصەیب تا ئالآکە هەڵگرێت و بیبات بۆ ماڵی ئوسامەی کوڕی زەید، ئەویش ئالآکەی برد بۆ سەربازگەی یەکەمی موسڵمانان کە ئوسامەی کوڕی زەیدی لێ بوو، هەرچەندە کاتی هەڵگەرانەوەی عەرەبەکان بوو و هەوڵ درا ئەبووبەکر رازی بکرێت تا ئوسامەی کوڕی زەید بەو سوپایەوە نەنێرێت بەڵام ئەبووبەکر رازی نەبوو سوپایەك بوەستێنێت کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کردبوو بە رۆیشتنی.

کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کرد ئوسامە بە عومەری وت برۆ بۆ لای خەلیفەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و داوای مۆڵەتی لێ بکە تا سوپاکە بهێنمەوە مەدینە، چونکە

کەسایەتیە دیارەکان لەگەڵ منن، من ترسم هەیە زیان بە خەلیفە بگات و بێباوەڕان گورزی خۆیان بوەشێنن، پشتیوانەکانیش بە عومەریان وت پێی بڵێ ئەگەر هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی سوپاکە بڕوات، با کەسێکی بەتەمەنتر لە ئوسامە بکاتە بەرپرس، عومەریش چوو بۆ لای ئەبووبەکر، عومەر کە گەیشتە لای ئەبووبەکر و قسەکانی بۆ باسکرد، ئەبووبەکر وتی بەخوا ئەگەر سەگ و گورگ بمبەن بڕیاری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ناکشێنمەوە، عومەر ئەوکات پەیامەکەی پشتیوانانی گەیاند، ئەبووبەکریش ریشی عومەری گرت و وتی دایکت رۆڵەرۆت بۆ بکات کوڕی خەططاب، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەوی کردووە بە کاربەدەست و تۆیش داوام لێدەکەیت من لایبەرم؟ عومەریش چوویە دەرەوە بۆ لای خەڵکەکەو پێی وتن بڕۆن وازبێنن، دایکتان رۆڵەرۆتان بۆ بکات، بەهۆی ئێوەوە خەلیفە زۆری پێکردم، ئینجا خەلیفە خۆی سوپاکەی ئوسامەی بەڕێکرد، بەڵام داوای کرد مۆڵەت بدات عومەری لا بهێڵێتەوە تا پشتیوانی بێت، ئوسامەش رازی بوو.

## جەنگی هەڵگەڕاوەکان:

کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کردو خەڵکێك لە عەرەب بێباوەڕ بوون، ئەبووبەکر ویستی جەنگیان بکات، عومەر وتی ئەی ئەبووبەکر چۆن جەنگی ئەو خەڵکە دەکەیت لەکاتێکدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (أمرت أن أقاتل الناس حتى يقولوا لا إله إلا الله، فمن قالها فقد عصم مني ماله ونفسه إلا بحقه، وحسابه على الله)، (فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵك بجەنگم تا دەڵێن لا اله الا الله، جا هەرکەس ئەوەی وت ئیتر سامان و گیانی لێم قەدەغە دەبێت بە حەقی خۆی نەبێت، حیسابیشی لای خوایە)، ئەبووبەکر وتی بەخوا هەرکەس جیاوازی بکات لەنێوان نوێژ و زەکاتدا لەگەڵی دەجەنگم، چونکە زەکات مافی سامانە، سوێند بەخوا ئەگەر گێسکێکیان دابێت بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئێستا نەیدەن بە من ئەوە لەسەر ئەوە جەنگیان لەگەڵ دەکەم، عومەر

دەڵێت هێندەی نەبرد خوا سینەی فراوان کردم بۆ راکەی ئەبووبەکر و زانیم راکەی ئەو راستە.

ئەبووبەکری صدیق دژبە هەڵگەڕاوەکان جەنگی راگەیاند، بۆ ئەوەش مەترسی لەسەر مەدینە دروست دەبوو، بۆیە پاسەوانی شەوانەی بە دەوری مەدینەدا دانا و بڕێك كەسی کرد بە ئەمیری دەستەی ئەو پاسەوانانە، لەوانەش عەلی کوڕی ئەبوو طالیب و زوبەیری کوڕی عەووام و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و طهلحەی کوڕی عوبەیدوڵا و سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و عەبدوڵای کوڕی مەسعوود.

پاش تەواوبوون لە ئەرکی سوپاکەی ئوسامەی کوڕی زەید، ئەبووبەکری صدیق یانزە لیوای پێکهێنا بۆ جەنگی هەڵگەڕاوەکان، ئینجا لیوایەکی تایبەت کرد بە خالیدی کوڕی وەلید و رایسپارد بچێت بەرەو لای طولەیحەی کوڕی خوەیلید، ئەگەریش لەو ئەرکەی لێبوویەوە ئینجا بڕوات بەرەو لای مالیکی کوڕی نوەیرە.

ئەبووبەکر کاتێك خالیدی کردە بەرپرسی ئەو لیوایە بە خەڵکەکەی وت من بیستوومە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەیفەرموو (نعم عبدالله و أخؤ العشیرة خالد بن الولید سیف من سیوف الله سله الله علی الکفار و المنافقین)، (خالید بەندەیەکی چاکی خوا و پیاوماقووڵێکی ناو هۆزە، شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خوا کە هەڵکیردووە بە ڕووی بێباوەڕان و دووڕووواندا)، ئینجا خالید کەوتەڕێ و ئەبووبەکر ماڵئاوایی لێکرد و بەڵێنی پێدا لە ناوچەی خەیبەر لەگەڵ سەرکردەکانی تر پێیدەگاتەوە، ئەم پلانەش بۆ ئەوەبوو دوژمن بترسێـت.

## لەناوبردنی فیتنەی طولەیحەی ئەسەدی

خالید بە سوپاکەیەوە چوو بەرەو لای طولەیحە کە خەڵکێکی زۆری لە دەوری خۆی کۆکردبوویەوە.

خالید کە نزیك بوویەوە لە بەنی طەییء، عەددی کوڕی حاتەم هات بۆ لای و وتی سێ رۆژ مۆڵەتم بدە، چونکە ئەو خەڵکە دەترسن ئەگەر شوێن تۆ بکەون طولەیحە نێردراوەکەیان بکوژێت، خالیدیش مۆڵەتی دا، سێ رۆژەکە تەواو بوو، ئینجا عەددی بە پێنج سەد جەنگاوەرەوە هاتە لای خالید، دواتر خالید چوو بەرەو لای بەنی جدیلە، ئەویش وتی ئەی خالید چەند رۆژێك مۆڵەتم بدە بەڵکو خوا ئەمانیش وەك طهییء رزگار بکات، موسڵمانەکانی ئەوێش دایانە پاڵ سوپاکەی خالید کە نزیکەی هەزار سوارەیان هەبوو، ئینجا لەوێوە خالید چوو تا گەیشتە ناوچەی بەئجەئو سەلما و لەوێ سوپاکەی رێکخست و لەوێ لە ناوچەیەك کە پێی دەوترێت بزاخە لەگەڵ طولەیحەدا پێکگەیشت،

جەنگ لەنێوانیاندا روویدا، لە کاتی جەنگەکەدا طولەیحە وایگەیاندبوو کە جوبرەئیل دێت بۆ لای و پەیامی بۆ دێنێت، عویەینە ساتێك لە جەنگەکەدا بوو و ساتێکیش دەچوویەوە بۆ لای طولەیحەو دەیوت جوبرەئیل هات بۆ لات؟

دواتر کە زانی راست ناکات پاشەکشەی کرد بە سوپاکەی، ئیتر سوپاکەی طولەیحە کەوتنە پەرت بوون، طولەیحەش خێرا ژنەکەی خۆی سوار کرد و رایکرد و بە سوپاکەی وت کامتان دەتوانن خۆتان و ژنتان رزگار بکەن، بەوە سوپای طولەیحە شکا، ئینجا هۆزەکانی لای طولەیحە خۆیان دا بەدەستەوەو وتیان دەگەڕێینەوە ناو ئیسلام و رازین بە هەموو حوکمێکی ئیسلام، خالیدیش نامەی نووسی بۆ ئەبووبەکر و هەواڵەکەی پێدا، ئەبووبەکریش وەڵامی دایەوەو فەرمانی پێکرد لەخواترسی لە کردارەکانیدا زیاتر بکات و فەرمانیشی پێکرد کامیان پێشتر کوشتاری موسڵمانانی کردووە تۆڵەی لێ بکاتەوەو هەرکەسیش سنووری خوای بەزاندووە بەو جۆرەی خالید خۆی بە بەرژەوەندی بزانێت بڕیار بدات بە کوشتن یان مانەوەیان،

خالیدیش ماوەی مانگێك لەوێ مایەوەو كێشەكانی ئەوێی چارەسەر دەكرد چ لە گێڕانەوەی مافی ستەم لێكراوان و چ لە سزادانی تاوانباران، تەنانەت ئەوەی موسڵمانانی سووتاندبوو خالید سووتاندیەوە، ئەوەی لە شاخەوە موسڵمانانی دەخستە خوارەوە خالید وای پێكردەوە.

## لەناوبردنی مالیکی کوڕی نوەیرە

پاش ئەوە خالید چوو بەرەو لای مالیکی کوڕی نوەیرە، چونکە مالیکی کوڕی نوەیرە پاش وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە ئیسلام هەڵگەڕابوویەوە، ئەوەبوو کاتێك خالید چوو بۆ ئەوێ قسەی لەگەڵدا کرد.

ئیتر لێرەوە راجیاییەکان پەیدا دەبن سەبارەت بە هەڵوێستی مالیك:

مالیك بە خالیدی وت سەبارەت بە نوێژ ئامادەم نوێژ بکەم، بەڵام سەبارەت بە زەکات ئامادە نیم زەکات بدەم.

ئەمە هەڵوێستی پێشووتریشی بوو، ئەوەبوو کاتێك هۆزەکەی زەکاتیان کۆکردەوە تا بینێرن، مالیکی کوڕی نوەیرە رێی نەدا و هەر لەناو خۆیاندا دابەشی کرد.

مالیکی کوڕی نوەیرە پەیوەندی بە سەجاحی ژنە شاعیرەوە هەبوو کە بانگەوازی پێغەمبەرایەتی کردبوو و بڕیاری دابوو بە شوێنکەوتەکانیەوە هێرش بباتە سەر مەدینە، مالیکیش چوو

بەدەم بانگەوازەکەی سەجاحەوە، بەڵام کاتێك سەجاح پەیوەندی کرد بە موسەیلەمەی درۆزنەوە ئیتر مالیك پەشیمان بوویەوەو چوو بۆ ناوچەیەك کە پێی دەوترا بطاح، خالیدیش بڕیاری دا بچێت بۆ ئەوێ، بەڵام سوپای پشتیوانان کە لەگەڵ خالید بوون وتیان ئێمە نایەین و تەنها ئەوە دەکەین کە ئەبووبەکر فەرمانی پێداوین، خالیدیش لە وەڵامدا وتی ئەم کارە هەر دەبێت بکرێت و دەرفەتێکە دەبێت بە هەند وەربگیرێت، ئێستاش هیچ نامەیەکم لەو بارەوە بۆ نەهاتووە، من ئەمیرم و فەرمانەکانم بەدەستە، بەڵام ناچاریشتان ناکەم بێن لەگەڵم، وا من دەچم بەرەو بطاح، ماوەی دوو رۆژ رێی بڕی، ئینجا پشتیوانان رایان لەسەر ئەوە کۆك بوو کە دەبێت لەگەڵ خالید بچین چونکە ئەو ئەمیرە، خێرا نێردراویان نارد تا بە خالید بڵێت چاوەڕێیان بکات تا خۆیان دەگەیەننەوە پێی، ئەوەبوو خۆیان گەیاندەوە بە خالید.

خالید کە گەیشتە ئەوێ برێ کەسی نارد تا خەڵکەکە کۆبکەنەوە، خەڵکەکەش کۆبوونەوەو گوێڕایەڵی خۆیان بۆ نواند و ئامادە بوون زەکاتیش بدەن، تەنها مالیکی کوڕی نوەیرە نەبێت کە کەناری گرتبوو و خۆی یەکلا نەکردبوویەوەو نەیدەزانی چی بکات، ئەوەبوو خۆی و هاوەڵەکانی بە دیل گیران، ئەبووقەتادەی ئەنصاری دەڵێت: من شایەتیم دەدا کە نوێژیان دەکرد، کەسانێکی تر هەبوون شایەتییان دەدا کە نە بانگیان دەدا و نە نوێژیان دەکرد، شەوێك لە شەوەکان کە سەرمایەکی زۆر بوو هاوارکەرەکەی خالید هاواری کرد دیلەکانتان گەرم بکەنەوە، کەچی پاسەوانەکان وایانزانی مەبەستی ئەوەیە دیلەکان بکوژن، بۆیە کەوتنە کوشتنی دیلەکان، ضیراری کوڕی ئەوزیش مالیکی کوڕی نوەیرەی کوشت، هاوارکەرەکە کە هاواری کوشتنەکانی بیست خێرا هاتەدەرەوە، کەچی بینی تازە کار لەکار ترازاوە.

رایەکی تر دەڵێت: بەڵکو هۆکاری کوژرانەکەی مالیك ئەوەبوو کە خالید مالیکی بانگ کرد و پێی وت تۆ پێشتر شوێن سەجاح کەوتیت و ئامادە نەبوویت زەکات بدەیت، ئینجا خالید وتی مەگەر نازانیت نوێژ و زەکات پێکەوە باس کراون؟ مالیکیش وتی هاوەڵەکەی تۆ وای وتووە، خالید وتی مەگەر ئەوە بەس هاوەڵی ئێمەیە و هی تۆ نیە؟ ئەی ضیرار بدە لە گەردنی، ئەویش دای لە گەردنی.

گێڕانەوەیەکی تر وا هاتووە کە خالید ئەبو قەتادەو دەستەیەکی تری نارد، کە گەیشتنە لای مالیك وتی ئێوە کێن وتیان موسڵمانانین، مالیکیش وتی منیش بەندەی موسڵمانی خوام، ئەبوو قەتادە وتی دەی چەکەکانتان دابنێن، ئەوانیش چەکەکانیان دانان و بەسترانەوەو بران بۆ لای خالید، لەوێ ئەبوو قەتادە وتی ئەمانە موسڵمانن و پەنا دراون، بەڵام ئەندامانی تری دەستەکە وتیان بەڵکو هیچ پەنایەکمان نەداون و بە زۆرەملێ هێنراون، بۆیە خالید فەرمانی کرد بە کوشتنیان.

قەتادە بە کوشتارەکەی خالید نارازی بوو و لەو بارەوە مشتومڕی لەگەڵ کرد و گەڕایەوە بۆ لای ئەبووبەکر و سکاڵآی لە خالید کرد، هەروەها ئەوانەی بۆ عومەریش باس کرد، عومەریش چوو ئەبووبەکری دواند و وتی خالید لابەرە چونکە شمشێرەکەی خوێن ڕێژی زیادە دەکات، ئەبووبەکر وتی شمشێرێ کە خوا هەڵیکردووە بە ڕووی بێباوەڕاندا نایخەمەوە کالآن، ئینجا براکەی مالیکیش هاتە لای ئەبووبەکر و سکاڵآی خالیدی کرد، عومەریش پاڵپشتی دەکرد، ئەبووبەکریش خوێن باییەکەی مالیکی دا بە براکەی.

## سەبارەت بە کوژرانی مالیك ئەم چەند خاڵە دەخەینەڕوو:

یەکەم: راجیایی هەیە ئایا مالیك بە بێباوەڕی کوژراوە یان بە موسڵمانی، بەڵام ئەگەر تەماشا بکەین لە هەموو گێڕانەوەکاندا ئەوە چەسپاوە کە مالیك ئامادەیی ئەوەی نەبووە زەکات بدات، جا ئەگەر گێڕانەوەی یەکەم بێت کە شەو لەگەڵ دیلەکانی تر کوژرابێت ئەوە بە هەمان چەشنی هەڵەکەی پێشووتری (صبأنا، صبأنا) بووەو وەك لە گێڕانەوەکەدا هاتووە خالید مەبەستی نەبووە بیکوژێت، ئەگەریش بە گێڕانەوەی دووەم بێت کە تیایدا مالیك لەبەردەم خالیددا حاشای کردووە لە واجب بوونی زەکات، ئەوە دەزانین ئەبووبەکر لەبەر نەدانی زەکات فەتوای جیهاد و کوشتنی ئەوانەی دا کە ئامادەی زەکات دان نین.

دووەم: لەوانەیە رارایی زۆری مالیك وایکردبێت بارەکە ئاڵۆز بکات، سەرەتا چوونی بۆ لای سەجاح، دواتر دەستبەرداربوونی لە سەجاح و گەڕانەوە بەرەو ئیسلام، دواتر بەرگرتن لە هۆزەکەی تا زەکات نەدەن، هەروەها دواتر هەڵوێستێکی وای

بووە کە موسڵمانانی دوو لەت کردووە، دەستەیەك بە موسڵمانیان داناوە وەك ئەبووقەتادە، دەستەیەکیش بە شیاوی کوشتنیان داناوە وەك خالید، لەسەر ئەو دوو بڕیارە جیاوازەش حوکمی دوو گەورە هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) لەسەری جیاواز دەبێت، عومەر خالید بە هەڵەو تاوانبار دەزانێت لەو کوشتنەدا و پێی وایە ئیتر دەبێت خالید پۆستەکەی لێ بسەنرێتەوە، ئەبووبەکریش لەوپەڕی قەناعەتیدا بە ئیجتیهادێکی هەڵەی خالیدی دەزانێت و ئامادە نیە خالید لابەرێت و خوێن باییەکەی مالیك دەدات، ئەم هەڵوێستەی ئەبووبەکریش ڕاستتر بوو، چونکە پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) پێشتر لە بارێکی لەو چەشنەدا هەمان هەڵوێستی ئەبووبەکری هەبوو، ئەبووبەکریش پێشەنگی کرد بە پێغەمبەری خواوە(صلى الله علیه وسلم)، ئەوەبوو کاتێك خالید لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله علیه وسلم) بە ئیجتیهادێکی هەڵە خەڵکانێکی کوشت، پێغەمبەر (صلى الله

علیه وسلم) خالیدی لە بەرپرسیارێتیەکان لانەبرد، هاوکات خوێن بایی کوژراوەکانی دا.

سێیەم: سەبارەت بە هەڵوێستی ئەبوو قەتادەی ئەنصاری پێدەچێت راراییەکەی مالیك وای لە هەڵوێستی کردبێت، چونکە مالیکی کوڕی نوەیرە دوای دەستبەرداربوونی لە سەجاح رارا کەوتبوو، لەلایەکەوە دەیویست بەرنگاری سوپای موسڵمانان نەبێتەوە، لەلایەکیشەوە ئامادە نەبوو زەکات بدات، پێدەچێت لە دواندنی ئەبووقەتادەدا جۆرێك لە بروابوونی بە زەکات دەربڕیبێت و لای خالیدیش هەڵوێستی بڕوانەبوونی هەبووبێت.

بەهەرحاڵ هەڵوێستەکەی خالید خۆی لە دوو ئەگەردا دەبینێتەوە:

یان بە ئیجتیهادێکی هەڵە مالیکی کوڕی نوەیرەی کوشتووە.

یان بە حەق پەیڕەوی بڕیاری خەلیفەی کردووە بۆ کوشتنی ئەوانەی حاشا لە زەکات دەکەن.

بەڵام بە هەڵوێستی ئەبووقەتادەو عومەر و ئەبووبەکردا دەردەکەوێت ئەگەری زیاتر ئەوە بووە کە خالیدی کوڕی وەلید بە ئیجتیهادێکی هەڵە مالیکی کوڕی نوەیرەی کوشتووە، حوکمی ئەبووبەکر و عومەریش لە بارەی خالیدەوە جیاواز بوو و حوکمەکەی ئەبووبەکریش دروستتر بوو چونکە پێشەنگی کردن بوو بە هەڵوێستێکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە هەمان چەشنی ڕووداودا.

هەروەها بەڵگەیەکی تر ئەوەیە کەکاتێك عومەر لای ئەبووبەکر دژی خالید قسەی کرد ئەبووبەکر وا وەڵامی دایەوە: لەسەرخۆ بە ئەی عومەر، خالید ئیجتیهادێکی کردووەو هەڵەی تێدا کردووە، دەی زمانت بگرەوە لە خالید، چونکە من شمشێرێك داناگرم کە خوا بە ڕووی بێباوەڕاندا هەڵیکردووە.

## هاوسەرگیری خالید و ژنەکەی مالیکی کوڕی نوەیرە

ئەم بابەتە لە مێژوودا بووەتە تانەیەك بۆ خالیدی کوڕی وەلید، کاتێك خالید مالیکی کوڕی نوەیرەی کوشت دواتر لەگەڵ ژنەکەیدا هاوسەرگیری کرد، جا دەستەیەك بە چەند بەڵگەیەك ئەوە بە ڕەوا دەزانن، دەستەیەکیش بە نارەوای دەزانن و دەڵێن خالید لەبەر ژنەکەی مالیکی کوشتووە.

بەپێی گێڕانەوەیەك هاتووە خالید پاش کوشتنی مالیك وەستا تا ژنەکەی ماوەی پاکبوونەوەی تەواو بوو، بەڵام ئەبووبەکر سەبارەت بە هاوسەرگیریەکەی لێی تووڕە بوو.

کاتێك مەسەلەکە لای ئەبووبەکر و عومەر قسەی زۆری لێکرا، ئەبووبەکر فەرمانی کرد خالید بێتەوە مەدینە، کە خالید هاتەوە عومەر پێی وت بە ناحەق موسڵمانێکت کوشتووەو ژنەکەیشت بردووە، دەبێت سزا بدرێیت، کاتێك خالید چوو بۆ لای ئەبووبەکر و دواندی، خالید بەڵگەی هێنایەوە بۆ کارەکەی و توانی قەناعەت بکات بە ئەبووبەکر، ئەبووبەکر بەڵگەکانی

خالیدی پەسەند کرد و خوێن بایی مالیکی دا و وازی هێنا لە خالید و لە پۆستەکەیدا هێشتیەوە.

بەهەرحاڵ بەپێی دەقە مێژووییەکان مەسەلەی کوشتنی مالیك هیچ پەیوەندیەکی نەبووە بە ژنەکەیەوە، بەڵکو هاوسەرگیری دوای ئەوە قسەی لەسەرە کە ئایا ڕەوا بووە یان نا، ئەمەش نارەزایی عومەر و ئەبووبەکریشی لەسەر بووە.

## جەنگی یەمامە

خالیدی کوڕی وەلید دوای ئەوەی لەلایەن خەلیفە پۆزشی قبووڵ کرا، بە فەرمانی خەلیفە ئەبووبەکری صدیق چوو تا فیتنەی موسەیلەمەی درۆزن لەناوبەرێت کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد و خەڵکێکی زۆری لەخشتە بردبوو، لەو کارەشیدا تەواو سەرکەوتوو بوو، پێشتر لە باسی ژیانی خالید و لە چەند شوێنی تریشدا باسی جەنگی یەمامەمان کردووە، بۆیە دووبارەی ناکەینەوە.

## کۆکردنەوەی قورئان

لە سەردەمی ئەبووبەکری صدیقدا زەید راسپێردرا تا قورئان کۆبکاتەوە، زەید دەڵێت ئەبووبەکر پێی وتم تۆ کەسێکی گەنج و عاقڵیت و تۆمەتبارت ناکەین، تۆ لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) سروشت بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەنووسیەوە، دەی بنەوە قورئان و کۆی بکەرەوە، منیش وتم چۆن شتێك ئەکەن کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەیکردووە، ئەویش وتی بەوا ئەمە خێرە، ئیتر ئەبووبەکر هێندەی پێ وتمەوە تا ئەوەی خوای گەورە دەروونی فراوان کردم بۆ ئەو نیازەی کە دەروونی ئەبووبەکرو عومەری بۆ فراوان کردبوو، کەوتمە کۆکردنەوەی قورئان.

زەید دەڵێت: دوای جەنگی یەمامە-کە ژمارەیەك لە هاوەڵان تیایدا شەهید بوون- ئەبووبەکر منی بانگ کرد، عومەریش لەلای بوو، ئەبووبەکر وتی (عومەر هاتووە بۆ لام و دەڵێت: لە یەمامە خەڵکێکی زۆر کوژراوەو دەترسم بەم کوشتارە بەردەوامە ئەوانەی قورئانیان لەبەرە لەناوبچن و بەشێك لە قورئان نەمێنێت، بۆیە پێم باشە کۆی بکەنەوە، منیش پێم وتووە چۆن شتێك بکەم کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەیکردووە؟ عومەر دەڵێت: بەخوا ئەوە خێرە، هێندە عومەر هات بۆ لام و لێی دووبارە کردمەوە تا ئەوەی خوای گەورە دەروونی والآکردم بۆ راکەی عومەرو منیش هەمان رای ئەوم هەیە)، عومەریش لەولاوە دانیشتبوو و هیچی نەدەوت، ئەبووبەکر درێژەی دا بە قسەکانی و وتی (تۆ پیاوێکی گەنج و عاقڵیت و لێت دڵنیاین و نووسەرەوەی سروشیش بوویت، دەی لێبنەوەو قورئان کۆبکەرەوە)،

سوێند بەخوا ئەگەر ئەبووبەکر رایسپاردمایە کێوێك لەملاوە بۆ ئەولا بگوازمەوە هێندەی ئەو داواکاریەی لام سەخت نەبوو، منیش وتم چۆن ئێوە ئەو شتە دەکەن لە کاتێکدا پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) نەیکردووە، ئەبووبەکر وتی بەخوا ئەوە خێرە، ئیتر هێندە لێیان دووپات کردمەوە تا خوا دەروونی فراوان کردم بۆ راکەیان و کەوتمە کۆکردنەوەی قورئان، هەندێکی لەسەر پارچە پێستە نووسرابوویەوە، هەندێکی لەسەر ئێسقان و هەندێکی لەسەر گەڵآی دار نووسرابوویەوە، هەندێکیشی لە سنگی پیاواندا بوو.

## فتووحات لە سەردەمی ئەبووبەکردا:

لە سەردەمی ئەبووبەکردا لە دوو مەیدانی جیادا فتووحات پێشڕەوی بەهێزی بەخۆیەوە دی، ئەوانیش بریتی بوون لە بەرەی عێراق و بەرەی شام، لێرەدا باسی فتووحات ناکەین، چونکە بە زمانی کوردی نووسینی زۆر و پێویست لەو بارەوە هەن، خوێنەر دەتوانێت سوودیان لێ وەربگرێت.

## ژیانی ئاسایی لەگەڵ خەڵکدا:

کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کرد و خالیدی کوڕی وەلید لە یەمەنەوە گەڕایەوە، بینی ئەبوبەکر بەرپرسە، دڵگران بوو بە وەفاتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و بە دەربڕینێکی هەڵە خەمباری خۆی دەربڕی، بۆیە عومەر لێی تووڕە بوو و ئەو قسانەشی گەیاند بە ئەبووبەکر کە رای خالید چۆن بووە، بەڵام ئەبووبەکر ئەو قسانەی نەگرتەدڵ و خەڵکی کۆکردەوەو وتارێکی پێشکەش کرد و باسی جیهادی کرد بۆیان، دواتر ئاڵآی دەدایە دەست سەرکردەکان تا جەنگی هەڵگەڕاوەکان بکەن، ئاڵآی یەکەمیشی دایە دەست خالیدی کوڕی سەعید تا بەرەو شام بڕوات، هەرچەندە عومەر هێشتا لێی تووڕە بوو و هەوڵیدا بەر بە راکەی خەلیفە بگرێت، بەڵام ئەبووبەکر لە نیازی خالید تێگەیشت و ئەوەی نەگرتەدڵ.

کاتێك پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) کۆچی دوایی کرد ئیتر بیلال توانای نەما بانگ بدات، شارەکەی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) دەنگی بانگی بانگبێژەکەی پێغەمبەری خوای (صلى الله علیه وسلم) تێدا نەما، تەنانەت توانای ئەوەی نەما لە مەدینەش بمێنێتەوە، بۆیە هات بۆ لای خەلیفەی یەکەمی موسڵمانان ئەبووبەکری صدیق و داوای مۆڵەتی لێکرد تا بچێت بۆ جیهاد، ئەوەبوو کاتێك ئەبووبەکر لە رۆژی هەینیدا لەسەر مینبەر بوو، بیلال ئەبووبەکری دواند، خەلیفە داوای لێکرد بیلال لە مەدینە بمێنێتەوە، بیلال لە وەڵامدا پێی وت لەبەر خوا ئازادت کردم یان لەبەر خۆت؟ ئەبووبەکر وتی لەبەر خوا، بیلال وتی دەی رێم بدە بچم بۆ جیهاد، خەلیفەش رێی پێدا و بیلالیش چوو بەرەو شام.

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە بیلال بە ئەبووبەکری وت من لە پێغەمبەری خوام (صلی الله علیه وسلم) بیستووە دەیفەرموو (أفضل أعمال المؤمن الجهاد في سبيل الله). (چاکترین کاری باوەڕدار جیهادی ڕێی خوایە)، جا منیش دەمەوێت تا مردن لە سەنگەری جیهاددا بم، ئەبووبەکر وتی ئەی بیلال سوێندت دەدەم بە خوا لەبەر ڕێز و مافی من مەڕۆ، وا من پیر بووم و مەرگم نزیك بوەتەوە، ئیتر بیلال لەگەڵ ئەبووبەکر مایەوە تا وەفاتی کرد، ئینجا هات بۆ لای عومەر و داوای مۆڵەتی کرد، عومەریش هەمان شتی پێ وت، بەڵام بیلال بە داواکەی ڕازی نەبوو، عومەر داوای لێکرد بانگ بداتی بیلال وتی من بانگبێژی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بووم تا وەفاتی کرد، دواتریش بانگبێژی ئەبووبەکر بووم چونکە ئەو چاکەی هەبوو بەسەرمەوە، من لە پێغەمبەری خوام (صلی الله علیه وسلم) بیستووە دەیفەرموو (ئەی بیلال کارێك نیە چاکتر بێت لە جیهادی ڕێی خوا)، بۆیە بیلال چوو بەرەو شام.

بەڵام ئیبن کەثیر دەڵێت راستتر و باوتر ئەوەیە بیلال دوای وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بانگی نەداوە بۆ ئەبووبەکر و چووە بۆ شام.

کاتێك ئەبووبەکری صدیق بووبوو بە خەلیفە، کچەکەی سەعد چوو بۆ لای ئەبووبەکر، خەلیفەش جلەکەی خۆی وەك راخەر بۆ راخست، عومەر هاتە ژوورەوەو پرسیاری لێکرد ئەو ئافرەتە کێیە؟ ئەبووبەکر وتی کچی کەسێکە کە لە من و تۆیش زۆر چاکتر بووە، عومەر وتی ئەی خەلیفەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەو پیاوە کێیە؟

وتی کەسێك لە سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەفاتی کرد و شوێنی خۆی لە بەهەشت بەدەست خست و من و تۆیش هێشتا ماوینەتەوە.

سالیمی مەولا جارێك لەگەڵ ئەبووبەکردا بوو کە نوێژی دەکرد، سالیم وتی ئەی خەلیفەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نان ناخۆیت؟ ئەویش بە دەست ئاماژەی بۆ کردم،

جاری دووەم هەمان شتی وتەوەو ئەویش بە ئاماژە پێی وت ڕاوەستە، جاری سێیەم کە سالیم وتی، ئەبووبەکر وتی خواردنەکەتم بۆ بهێنە، نانی خوارد و دواتر دوو ڕکات نوێژی کرد، ئینجا چوویە مزگەوت و نوێژ دابەسرا.

## وەفاتی ئەبووبەکری صدیق

لە مانگی جومادیلئاخیرەی ساڵی سیانزەی کۆچیدا ئەبووبەکری صدیق تووشی نەخۆشی بوو و ماوەی نزیکەی پانزە رۆژ نەخۆشیەکەی بەردەوام بوو، لەو ماوەدا عومەری کوڕی خەططاب بەرنوێژی دەکرد بۆ موسڵمانان، لەو ماوەدا ئەبووبەکری صدیق عومەری کوڕی خەتتابی بۆ جێگرتنەوەی خۆی دیاری کرد و عوثمانی کوڕی عەففانی بانگ کرد و داوای لێکرد بە نووسراوێك ئەوە بنووسێت، ئینجا نووسراوەکە خوێنرایەوە بەسەر موسڵماناندا و ئەوانیش رازی بوون.

ئەبووبەکری صدیق لە بیست و دووی جومادیلئاخیرەی ساڵی سیانزەی کۆچیدا وەفاتی کرد،_ئەو رۆژەی وەفاتی کرد رۆژی دووشەممە بوو، دەوترێت لە بەرەبەیاندا وەفاتی کرد، رایەکیش دەڵێت بەڵکو دوای نوێژی ئێوارە وەفاتی کرد، تەمەنیشی شەست و سێ ساڵان دەبوو.

حەسەنی کوڕی عەلی ئامادەی کاتی وەفاتی ئەبووبەکری صدیق بوو، حەسەن دەڵێت کاتێك ئەبووبەکر سەرەمەرگی هات بە عائیشەی وت ئەی عائیشە سەیری ئەو وشترە بکە کە لە شیرەکەیمان دەخواردەوەو ئەو تەشتەی بەکارمان دەهێنا و ئەو بەرگەی دەمانپۆشی، ئێمە کاتێك کاروباری موسڵمانانمان بەدەست بوو ئەو شتانەمان بەکاردەهێنا، جا ئەگەر مردم ئەوانە ببە بۆ عومەر، ئەوەبوو کە ئەبووبەکر مرد ئەو شتانەی نارد بۆ عومەر، ئەویش وتی خوا لێت رازی بێت ئەی ئەبووبەکر، باری ئەوەی دوای خۆتت قورس کرد.

ئەسید باسی ئەو رۆژە دەکات کە خەلیفەی موسڵمانان ئەبووبەکری صدیق کۆچی دوایی کرد و دەڵێت:

کاتێ ئەبووبەکر وەفاتی کرد بە بەرگێ دایانپۆشی و گریان مەدینەی گرتەوەو خەڵکی شڵەژان چەشنی ئەو رۆژەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کۆچی دوایی کرد، عەلی کوڕی ئەبووطالیب خێرا بە گریانەوە گەڕایەوەو دەیفەرموو

(ئەمڕۆ خیلافەتی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) دابڕا)، ئینجا هات تا گەیشتە بەردەرگای ئەو ماڵەی ئەبووبەکری تێدا بوو، وەستا و وتی: (بەر ڕەحمەتی خوا کەویت ئەی ئەبووبەکر، تۆ یەکەم کەس بوویت موسڵمان بوویت، لەهەموان پوختتر و دڵسۆزانەتر باوەڕت هێنا، دڵنیایی و بێگومانیت لە هەموان زیاتر بوو، لە هەموان لەخواترس تر و دەوڵەمەندتر بوویت و لە هەموان زیاتر لە دەوری پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) بوویت... پلەوپایەت لە هەموویان بەرزتر بوو، پێشرەوی هەموویان بوویت، پلەت لەهەموویان بەرزتر بوو، لە هەموویان زیاتر لە پێغەمبەری خواوە نزیك بوویت، لەرووی ڕەوشت و هەڵوێستەوە لە هەموان زیاتر لە پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) دەچوویت، لای پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) لە هەموویان جێ متمانەتر و پایەبەرزتر بوویت و بەڕێزتریان بوویت لە خزمەتیدا، دەی خوای گەورە لەسەر ئیسلام و پێغەمبەرەکەی و موسڵمانان پاداشتی خێرت بداتەوە، کاتێ

خەڵکی پێغەمبەری خوایان بە درۆزن دەزانی تۆ بەراستت دەزانی، بۆیە خوای گەورە لە کتێبەکەی خۆیدا بە صدیق ناوی هێنایت (و الذي جاء بالصدق)، کاتێ خەڵکی بەرامبەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پیسکە بوون، تۆ شوێنکەوتە و دڵنەواکەری بوویت، کاتێ خەڵکی دانیشتن و لەگەڵی نەچوون تۆ لەگەڵیدا راوەستایت، لەکاتی سەختیدا بە جوانترین شێوە هاوەڵی ئەوت کرد، سوکنایيت بۆ دەهێنا و هاورێی کۆچ و باروحاڵی نارەحەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوویت، دوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەجوانترین شێوە خیلافەتت کرد بۆ ئوممەتەکەی، کاتێ خەڵکی لە ئیسلام هەڵگەرانەوە بەجۆرێك ئایینی خوات بەجێگەیاند کە خەلیفەی هیچ پێغەمبەرێکی پێشتر وا بەجێی نەگەیاندووە، کاتی لاوازی هاوەڵانت بەهێز بوویت، کاتی ترسی ئەوان سەرپێ راوەستایت، وێرای پێ ناخۆشبوونی دووروان و بێزاری و توورەیی بێباوەران دەستت گرتبوو بە رێباز و بەرنامەی پێغەمبەری

خواوە، کاتێ دەوروبەرت شکستیان خوارد بە رووناکی خوا خیلافەتت گرتەدەست، لەسەروو هەموویانەوە بویت و لەهەموشیان کەمتر قسەت دەکرد و لە هەموان زیاتر راستیت دەپێکا و لە هەموان زیاتر بێدەنگ دەبوویت، رەوانبێژی و بڕیاردروستی و دلێری و دڵنیایی و کرداری چاك و شارەزاییت بە کارەکان لە هەموان زیاتر بوو، بۆ ئیسلام سەرگەورەیەك بوویت و بۆ باوەڕدارانیش باوکێکی میهرەبان، کاتێ بە خاوخێزانەوە دەهاتنە لات باری قورسی لاوازی ئەوانت دەگرتە ئەستۆ، چییان لەدەست دەدا تۆ دەتپاراست، چییان پشتگوێ بخستایە تۆ ئاگاداری دەبوویت، کاتی کەمصەبری ئەوان خۆڕاگر بوویت، ئەوەی ئەوان هەوڵیان بۆ دەدا تۆ پێی گەیشتیت، بەهۆی تۆوە گەیشتن بەوەی کە چاوەڕێ نەبوون دەستیان بکەوێ، بۆ بێباوەران سزایەك بوویت و دەرژایت بەسەریاندا، بۆ باوەردارانیش بارانی رەحمەت و بەرەکەت بوویت، بارانی دەوڵەمەندی و سوکنایی و پارێزگاری بوویت...

وەك شاخێ وابوویت کە رەشەبا نایجوولێنێت و شکێنەرەکان لەناوی نابەن... کەسی لاواز و زەلیل لای تۆ بەهێز بوو تا مافت بۆ وەردەگرتەوە، کەسی بەهێز و بە دەسەلاتیش لای تۆ زەلیل و لاواز بوو تا کاتێ مافت لێ وەردەگرتەوە، لەوەشدا دوور و نزیك لای تۆ وەك یەك بوون... بەخوا پێشڕەیو زۆرت کردو ئەوەی دوای تۆ دێت چاك ماندووی دەکەیت ... رازین بە قەزای خودا و ملکەچی کارو فەرمانی دەبین، دوای وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) موسڵمانان بە هیچ شتێ هێندەی مەرگی تۆ موصیبەتبار نابن...

خوای گەورە بتگەیەنێتەوە بە پێغەمبەرەکەت و ئێمەش لە پاداشتت بێ بەش نەکات و دوای تۆ گومڕامان نەکات) خەڵکی بێدەنگ بووبوون تا وتەکانی تەواو بوون، دواتر هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گریان و وتیان راستت فەرموو ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم).

## کۆتایی

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەستەی هەڵبژێردراو بوون بۆ وەرگرتنی پەیامی الله تعالی و بەجێگەیاندنی لەبەردەستی سەروەرماندا و ئەزموونکردنی لە دوای وەفاتی خۆشەویستمان، لەوەشدا نموونەی باڵا بوون و توانییان الله لە خۆیان ڕازیی بکەن و دەقەکانی قورئان و فەرموودە ئەستۆپاکییان بسەلمێنن.

جێی سەرنج بوو بۆم کەسانێك کە توانییێتیان الله تعالی لە خۆیان ڕازیی بکەن، بتوانن کۆتا پەیام لە کۆتا پێغەمبەرەوە ﷺ وەربگرن و بە ئەمانەتەوە بیگەیەنن بە مرۆڤایەتی و ئەمڕۆ ئێمە لەسەر بنەمای ئەو هەنگاوەی ئەوان سەرقاڵی دینداریی بین، دەکرێت چەند وانەیەکیان لێوە فێر ببین بۆ ژیانمان، بەڵکو ئێمەش بتوانین وەك ئەوان الله لە خۆمان ڕازیی بکەین و خزمەتێك بە نەوەی دوای خۆیشمان بکەین.

ئێمە بە دەقی قورئان ڕێنمایی کراوین پێشەنگیی بکەین بە پێغەمبەرانی خواوە ﷺ، وەك لە قورئاندا هاتووە (فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهِ)، هەروەها ڕێنمایی کراوین پێشەنگی بە کۆتا پێغەمبەرەوە بکەین ﷺ (لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ)، هاوەڵان یەکەم نموونە بوون کە توانییان ئەم پێشەنگییانە جێبەجێ بکەن و خوای گەورەش شایەتییان بۆ بدات و لێیان ڕازیی بێت، واتە براوە بون، دەبێت ئێمەش پێشەنگیمان بە هاوەڵانەوە هەبێت و لە شێوازی ژیان و هەڵسوکەوتیان وردبببینەوە، بزانین چۆن توانییان پاش وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ درێژە بە پەیامەکە بدەن و دینی الله تعالی بگەیەنن بە سەرجەمی مرۆڤایەتیی؟ ئاکار و ڕەفتاریان چۆن بوو؟

ئەگەر بتوانین لە ژیانی هاوەڵان و هۆکاری بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا لەلایەن ئەوانەوە بکۆڵینەوەو بگەینە ئەنجام، پاشان هەمان ڕێڕەو لە ژیانماندا بگرینەبەر، پشتیوان بە الله تعالی ئێمەش دەتوانین بگەین بە ڕەزامەندیی پەروەردگار.

فنسأل الله عز وجل أن يعجل فرج هذه الأمة اللهم أقم علم الجهاد واقمع أهل الزيغ والفساد وانشر رحمتك على العباد. يا من له الدنيا والآخرة وإليه المعاد وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين.

# سەرچاوە

- البداية و النهاية لابن كثير.

- الإصابة في تمييز الصحابة

- العواصم من القواصم.

- أسد الغابة، ج٣، ص ٦١٦.

- سير أعلام النبلاء للذهبي

- الطبقات الكبرى لابن سعد،

- الإستيعاب في معرفة الأصحاب،

- المعجم الكبير للطبراني،

- السيرة النبوية لابن هشام